





www.pzishkmagazine.com



ژمارەی تایبەت بە نەخۆشییەکانی گورچیلە

Protect your kidneys, Save your heart.



سەرنوسەر

## ڕۆژی جیهانیی گورچیلە

گۆڤاری پزیشک وئەودەستەپزیشکەپسپۆڕەی هەمووبوارەکانی پزیشکی،کەهاتوونەتەمەیدان بۆخزمەت گەیاندن بەڕاگەیاندن ورۆژنامەگەری کوردی.کارابوونی پسپۆڕی لەهەموبوارەکانی ژیان ووەرگرتنی ڕاوێژوپرس کردن بەکەسی پسپۆڕ.گۆڤاری پزیشک،بڕوای وایە:کەتەندروستی بەشێکەلەپێگەیشتنی جەستەوبیروکۆمەڵایەتی مرۆڤ،نەک تەنهادووربوون بێت لەنەخۆشی وپەککەوتەیی.هەرکاتێک مرۆڤ تەندروستی باش بوولەخۆشی وئارامی وئاسوودەیی وخۆش گوزەرانی دادەبێت.هەماهەنگ دەبێت لەدروست کردنی دەوروبەری تەندروست.مرۆڤەکان کەلەدەوروبەرێکی تەندروست ژیان،ئارامی وئاسایش وئاسوودەیی لەناوئەوکۆمەڵەبڵاوەی لێدەکات.هەرکاتێک کۆمەڵێک ئاسایش وئاسوودەیی لەناوبڵاوبۆوەئەوارێگاخۆش کەردەبێت بۆبڵاوبوونەی ئاسایش وئارامی لەناومیللەت ووڵات.واتاتەندروستی کاردانەوەی ڕاستەوخۆی لەسەرئاسایش وئارامی هەرێمی ونیشتیمانی ونەتەوەیی وناوچەیی وجیهانی هەیە،هەرلەورِوانگەیەوەدەبێت یارمەتیدەروپشتیوانی هەمولایەک بکرێت کەئامانجی بەرەوپێش بردنی باری تەندروستی ووڵاتە.

گۆڤاری پزیشک بەپێزانین بەورۆڵەی کەپێیسپێردراوە،دوای وەرگرتنی تێبینی ڕۆشنبیران وخەمخۆرانی بواری تەندروستی ولەبەرپێویستی بڕیاریدا:بەزیادکردنی ژمارەی لاپەڕەکانی گۆڤارەکە،بۆئەوەی هەرژمارەیەک بتوانێت زۆرترین نووسین لەسەرهەموبوارەکان وپسپۆڕیەکانی پزیشکی بڵاوبکاتەوە.خوێنەری کوردی ئاشنابکات بەهەمووئەوزانیاریانەی کەبۆدروستی باش پێویستی پێ دەبێت،ئەمەش بەهۆی نووسینی کەسانی پسپۆڕلەهەموبوارەکانی پزیشکیدا.هەرنووسینێک لەگۆڤاربڵاودەبێتەوەبەبەردەم لێژنەیەکی ڕاوێژکاری دادەچێت.مەرجی یەکەم ئەوەیەدەبێت پزیشک نووسینی پزیشکی بکات ولەوبوارەداپسپۆڕبێت.گۆڤارهیچ نووسینێک کەوەرگێردرابێت لەزمانەکانیدابڵاوناکاتەوەمەگەرخاوەنی ڕاستەقینەی نووسینەکەپسپۆڕی پزیشکی بێت ئەوکات بڵاودەکرێتەوە.گۆڤاری پزیشک هەرلەسەرەتای دەست بەکاربوونی ئەویەڵێنەی بەخوێنەرانی دابووکەبەشێوەی وەرزی ناوەناوەژمارەیەک بۆیەک لەنەخۆشیەکان تەرخان بکات بەتایبەتی ئەونەخۆشیەسەردەمیانەی کەلەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا وەکومۆتەکەبەدووی مرۆڤەکانن وهۆکاری سەرەکی مەرگن لەژیانی ئێستادا.ژمارەی ئەم جارەی گۆڤاری پزیشک تایبەتەبەنەخۆشیەکانی گورچیلە.نەخۆشیەکانی گورچیلەمەترسیەکی گەورەیە.یەکێکەلەنەخۆشیەماتەکان کەمرۆڤ هەستی پێناکات.تانەخۆشیەکەبەتەواوی دەستی لێ دەسێنێت وباری تەندروستی بەروخراپی نەبات نیشانەکان دەرناکەون.زۆرلەنەخۆشیەکانی گورچیلەهەن کەئەگەرهاتوولەسەرەتادادیاریکران وچارەسەری پێویستیان بۆکرائەوامرۆڤ لەماک وکاردانەوەخراپەکانی نەخۆشیەکەبەدووردەبێت یان ئەگەرهەرنەبێت نەخۆشیەکەی درەنگترلەسەریەدیاردەکەوێت.لەسەدەی بیست ویەک ئەوەدەرکەوتووەکەزۆربەی ئەوهۆکارانەی کەدەبنەهۆی نەخۆشیەکانی دڵ هەمان هۆکاردەبنەهۆی تووشبوون بەنەخۆشیەکانی گورچیلە.کەواتەئەگەرمرۆڤ خۆی پاراست لەهۆکارەکانی کەدەبنەهۆی نەخۆشیەکانی دڵ ڕاستەوخۆخۆپاراستنەلەتووشبوون بەنەخۆشیەکانی گورچیلە.هەرلەبەرئەوەکۆمەڵەی پزیشکانی نەخۆشیەکانی گورچیلەی جیهانی ساڵی2011 ئەودروشمەی بیەرزکردەوە:گورچیلەکانت بپارێزەماناى پاراستنی دڵە(Protect your kidneys, Save your Heart).لەزیاترلەسەد ووڵاتی جیهان ڕۆژی دەی ئازار،ڕۆژی جیهانی گورچیلەکۆڕوکۆبوونەوەوسیمیناروبەرنامەی تەلەفزیۆنی لەسەرگرنگی گورچیلەکان وهۆکارەکانی بەتایبەتی نەخۆشی شەکرەونەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن بۆهاووڵاتیان ڕوون دەکەنەوەوهانی ئەونەخۆشانەدەدەن کەنەخۆشی شەکرەونەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێنیان هەیەهەنگاوەکانی خۆپاراستن پیادەبکەن وناوەناوەپشکنینی تایبەت بەگورچیلەکان بۆخۆیان بکەن.هەروەهالەورۆژەدارۆڵ بینین لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری دروستی ورۆشنبیری گشتی وڕۆشنبیرکردنی کارمەندانی تەندروستی وپزیشکان سەبارەت بەمەترسیەکانی نەخۆشیەکانی گورچیلە.

گۆڤاری پزیشک بەهەست کردن بەبەرپرسیاریەتی وپەی بردن بەوکەم وکورپیەی لەبواری ڕاگەیاندنی پزیشکی وتەندروستی لەنێوپزیشکان وکارمەندانی تەندروستی وهاووڵاتیان هەیە.بۆئاشناکردنی خوێنەران بەورۆژەگرنگەژمارەی ئەومانگەی گۆڤاری پزیشک تەرخان کرابۆنەخۆشیەکانی گورچیلە.

# ڕۆژی جیهانیی گورچیله




پرۆفیسۆرویلیام ج.کاوسەر
پرۆفیسۆرمیگوێل س.ریێلا
William G. Couser،MD
Miguel C. Riella،MD
کۆمەڵەی پزیشکانی نەخۆشییەکانی گورچیلەی جیهانیی
(International Society of Nephrology)

لەدەی ئاداری ساڵی٢٠١١زرۆژێکی گرنگەئەویش ڕۆژی جیهانیی گورچیلەیە.کەئەورۆژەلەلایەن هەردووڕێکخراوی نێودەوڵەتی:کۆمەڵەی پزیشکانی نەخۆشیەکانی گورچیلە (International Society of Nephrology) ویەکێتی فیدرالی نێودەوڵەتی نەخۆشیەکانی گورچیلە (International Federation of Kidney Foundation) سەرپەرشتی دەکرێت.هەرلەڕۆژی دەست پێکردن بەدانانی ڕۆژێک وەک ڕۆژی جیهانیی گورچیلەلەساڵی٢٠٠٦ز (WKD)ئەویادکردنەوەیەپێشکەوتن وبەرەوپێش چوونی پێوەدیارە.ئێستایەکێکەلەڕۆژە هەرەبەناوبانگەکانی تەندروستی لەسەرانسەری جیهاندا.ئەورۆژەبۆتەهاندەرێک بۆپزیشکان ودەزگاتەندروستیەکان بۆئاگادارکردنەوەی هاووڵاتیان ووڵتەکان ودەسەڵاتەکان سەبارەت بەمەترسی نەخۆشیەکانی گورچیلەبەتایبەتی نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلە (CKD).ڕۆژی جیهانی گورچیلەلەساڵی٢٠١١ز (WKD)پەیامێکی گرنگی هەیە:ئەویش بریتیەلەڕۆلی نەخۆشیەکانی گورچیلەلەزیادبوونی ئەگەری تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ.کەئێستاهۆکاری یەکەمی مەرگەلەسەرانسەری جیهاندا.هەرلەبەرئەوەگرنگی بەزوودیاریکردن وخۆپاراستن لەنەخۆشیەکانی گورچیلەدراوەوئەوەڕوون بۆتەوەکەخۆپاراستن لەنەخۆشیەکانی گورچیلەدوورمان دەکات لەتووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ.لەشەشەم ساڵیادی ڕۆژی جیهانی گورچیلەلەدەی ئاداری٢٠١١زپێویستە ئەوەبزانین:کەنەخۆشیەکانی گورچیلەبەبەراوردلەگەل دەساڵی پێشووزۆرزیادی کردووە.هەمووئامارەکان لەهەموووڵاتانی جیهان شایەدی بۆئەوەدەدەن کەنەخۆشیەکانی گورچیلەبەشێوەیەکی بەرچاوزیادیکردووە. ئەمەش هۆکاربووەلەسەرف کردنی بڕی زۆرلەماڵ ودارایی بۆکەرتی تەندروستی.زۆربەی کات لەسەرانسەری جیهاندانزیکەی لە٨٠٪ئەوبڕەپارەیەی کەبۆچارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی گورچیلەپێویستەلەداهاتی نەخۆشەکەزیاترە،زۆربەی ماڵ ودارایی ئەوکەسەبۆچارەسەرکردنی نەخۆشیەکەدەچێت.لەودەساڵەی ڕابردووزۆرگۆڕانکاری ڕوویداوە،نەخۆشیەکانی گورچیلەئێستادەگمەن نین بەڵکو١٠٪دانیشتووان نەخۆشی خراپ کارکردنی گورچیلەیان هەیە (Renal Dysfunction)لەبەرئەوەی خەلک گرنگیەکەی نازانن ونیشانەی وادروست ناکات وکاتی دەوێت هەتادەبێتەپەککەوتنی گورچیلە (ESRD).ئەوەیان لەبیرنیەکەخراپ کارکردنی گورچیلەکان دەبێتەهۆی زوومردن وزیادبوونی ڕێژەی نەخۆشیەکانی دڵ،کەیەکەم دوژمنی سەرسەختی مرۆڤایەتیەلەم کاتەدا.هەرلەبەرئەوەبۆخۆپاراستن لەهۆکارەکانی تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ،نەخۆشیەکانی گورچیلەش وەک هۆکارێکی تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ ئەژمارددەکرێت.پشکنینی پێویست بۆزانینی باری تەندروستی گورچیلەکان (پرۆتین لەمیز (eGFR،Proteinuria)ئاسانەوتێچوونی کەمە.ئێستاپرۆتین لەمیزبۆئەوکەسانەدەکرێت کەهەنگاوەکانی خۆپاراستن لەنەخۆشیەکانی دڵ پیادەدەکەن یان خۆدەپارێزن لەنەخۆشیەکانی دڵ بۆزانینی ئەگەری تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ.ئەمەش مژدەبەخشەبەوەی لەگەل پیادەکردنی ئەوهەنگاوانەلەگەل ئەوەی دووردەبین لەنەخۆشیەکانی گورچیلەونەخۆشیەکانی دڵ،لەهەمان کاتدا لەنەخۆشیتری وەک نەخۆشی شەکرەبەدووردەبێت.ئاشکرابوونی ئەوڕاستیانەگۆڕانی تەواولەپلانی تەندروستی هەموووڵاتان دەکات.ئامانجەکانی ڕۆژی جیهانی گورچیلەبەدی نایەت تاهەماهەنگی تەواولەنێوان کۆمەڵەکانی تایبەت بەنەخۆشیەکانی گورچیلەوهاووڵاتیان وبەرپرسانی بواری تەندروستی هەموووڵاتان نەبێت.هەرلەبەرئەوەلەڕۆژی جیهانی گورچیلەلەدەی ئاداری ساڵی٢٠١١زهەمووهەماهەنگ بین لەگەیاندنی ئەوپەیامە:کەنەخۆشیەکانی گورچیلەڕاستەزۆربووەومەترسیدارەبەڵام چارەسەری هەیەوچارەسەری ئاسانە.هەروەهاگرنگی دان بەنەخۆشیەکانی گورچیلەوخۆپاراستن لەنەخۆشیەکانی گورچیلە هەنگاوێکی خۆپاراستنەلەنەخۆشیەکانی دڵ.

ژمارەی متمانەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان
(٣٧٨) لە ٢٠١٠/٦/١٦
www. pzishkmagazine. com

## فەرهەنگی پزیشکی
## Medical Dictionary

خوێنەرانی ئازیزوپزیشکانی بەڕێزئاگاداردەکەینەوەکەگۆڤاری پزیشک بەهۆی ئەوئەرکەی پێیسپێردراوەلەخزمەتکردنی بواری پزیشکی لەکوردستان. بەزانینی پێویستی زۆری ئەوانەی کەلەبواری پزیشکی دەخوێنن ودەنووسن وبۆزیاترخزمەت گەیاندن بەزانستی پزیشکی وبەرەوپێشبردن وخزمەتکردن ودەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری پزیشک بەشانازیەوە،ڕایدەگەیەنێت کەلەژمارەی داهاتووگۆشەیەکی نوێ بۆگۆڤارەکەمان زیاددەبێت کەئەویش گۆشەی:فەرهەنگی پزیشکییە. داواکارین لەهەموونووسەران وخوێنەران وپزیشکانی بەڕێزماناوواتای هەرووشەیەک کەبەکوردیەکەی دەزانن لەڕێگای پۆستی ئەلیکترۆنی سەرنووسەربۆگۆڤارەکەمان بنێرن بۆدەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی ورۆڵ ببینن لەدروستکردنی دەروبەری تەندروست. هاوکاریتان جێگای پێزانین وپێنازینە.

گۆڤاری پزیشک و دەستەی ڕاوێژکاری و دەستەی نووسەران، ڕێز و سوپاس و پێزانین و پێنازینی بۆ هەردوو کۆمەڵەی نێودەوڵەتی کۆمەڵەی پزیشکییەکانی نەخۆشییەکانی گورچیلەی جیهانیی (International Society of Nephrology) و یەکێتی فیدراڵی نێودەوڵەتی نەخۆشییەکانی گورچیلە (International Federation of Kidney Foundation) بە یارمەتیدانی گۆڤارەکەمان. ئەویش بە ناردنی پۆستەر و لۆگۆی تایبەت بە ڕۆژی جیهانی گورچیلە لە گەڵ نووسینی پێشەکی ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمان کە تایبەتە بە ڕۆژی جیهانی گورچیلە کە دەکاتە بەرواری دەی ئاداری ساڵی ٢٠١١ ز. کە لە نزیکەی سەد وڵاتی جیهان ئەو ڕۆژە وەبیردەهێنرێتەوە وەک هەنگاوێکی خۆپاراستن لە یەک لەو نەخۆشییە سەردەمی و ماتانەی کە بە مەترسی بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی دادەنرێت.

World Kidney Day
10 March 2011

خاوەن ئیمتیاز و سەر نووسەر:
د. ئازاد مەنتك
azadmantik@yahoo. com
٠٧٥٠٤٥٥٨٢١٧

دەستەی ڕاوێژکاران:
پرۆفیسۆر د. حمەنجم حمەفرج جاف
د. دەشتی بایز دزەیی
پرۆفیسۆر د. جەبار حسێن
پرۆفیسۆر د. بەهرام ڕەسووڵ
پرۆفیسۆری د. تەیب صابر كریم
د. نیاز شیخ جواد بەرزنجی
د. جەنگی شەوکەت ساڵەیی

بەڕێوەبەری نووسین:
سەوزە سعدی سعید

دەستەی نووسەران:
د. خالص قادر ئەحمەد
د. داوود حسن ڕەمەزان
د. ئازاد موستەفا مەحموود
د. پشتیوان مامە خدر
د. حسین علی عبداللە

بەڕێوەبەری ژمێریار و کارگێری: نەوروز

دیزاین:
وریا بوداغی
٠٧٥٠ ٤٣٦ ١٣٦٠

PAYK
تیراژ: (٤٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٠٠٠) دینار
کۆمپانیای پەیک بڵاوی دەکاتەوە

سندوقی پۆستە:
١٣/٠٨٤٥ زانکۆ / هەولێر
ناونیش هەولێر/١٠٠ مەتری
نزیک نەخۆشخانەی شیفا
www. pzishkmagazine. com

## له ژمارەی داهاتوودا ئەم بابەتانە بخوێنەوە:

١- نەخۆشی کەم خوێنی بە هۆی کەمی مادەی ئاسن.
٢- نەخۆشیی قەڵەوی چییە؟ هۆکارەکانی توشبوونی چییە؟
٣- نەخۆشیی سینگە کوژێ (الذبحة الصدرية)چییە؟
٤- خوێن بۆ لە لووت دێت؟
٥- بالووکە چییە؟ جۆرەکانی چین؟ چارەسەری چییە؟































# کۆئەندامی دەرهاویشتن


د. زانامۆستەفامەحموود
ماستەرلەتوێکاری/ کۆلیژی پزیشکی
زانکۆی هەولێری پزیشکی


کۆئەندامی دەرهاویشتن پێکهاتووەلەگورچیلەکان وبۆڕی میزومیزلّدان وجۆگەی میز. وەکاری ئەم کۆئەندامەش بریتیە لەدەرهاویشتنی زۆربەی ئەوپاشماوانەی کەلەئەنجامی زیندەپاڵەوە (Metabolism) دروست دەبن. هەروەهاگورچیلەکان ڕۆلی کارایان هەیەلەهاوسەنگ کردنی ئاووخوێیەکانی لەش وڕاگرتنی ڕادەی ترشی وتفتێتی خوێن. پاش دروستبوونی میزلەگورچیلەکان میزەکەبەهۆی بۆڕیەکانی میزەوەدەگوێزرێتەوەبۆمیزلّدان کەلەوێ هەڵدەگیرێ بۆماوەیەک وپاشان بەهۆی جۆگەی میزەوەدەکرێتەدەرەوە.

## گورچیلەکان:

بریتین لەجووتێک ئەندامی سووری قاوەیی باو کەدەکەوێتەپشتەوەی پێریتۆنیەم.



کەدەکەونەسەربەشی سەرەوەی دیواری پشتەوەی بۆشایی سک لەهەردوولای بڕبڕەی پشت. گورچیلەی ڕاست کەمێک لەخوارەوەی ئاستی گورچیلەی چەپەبەهۆی بوونی جگەرلەلای ڕاست. گورچیلەئەندامێکی پاقلەئاساییە،دیوی ناوەوەی کەمێک قۆپاوەیەولەودیوەیەوە (کەپێ ی دەڵێن:هایلەم) بۆڕی خوێن بۆگورچیلەدەچێ ودێتەدەرەوەوبۆڕی میزیش لەوێوەدەردەچێت. هەروەهاجۆگەی لیمفی ودەمارەڕیشالیەهەناویەکانیش لەوێوەبۆی دێن ودەچن یەک لەدوای یەک. گورچیلەکان بەبەرگێک داپۆشراون پێ ی دەڵێن:کەپسوولی گورچیلەپاشان دەورەدراوەبەچینێک چەوریەشانەپاشان دەورەدراوەبەپەردەی گیرۆتەئەمیش بەچینێکیتری چەوری دەورەدرواەکەگورچیلەکان بەدیواری پشتەوەی سک دەبەستێتەوە.

## پێکهاتەی ناوەوەی گورچیلە:

هەرگورچیلەیەک پێکهاتووەلەتوێکلێکی قاوەیی کەپێیدەڵێن توێکڵی گورچیلەوەپێکهاتووەلەبەشێکی ناوەوەی قاوەیی ئالچوغ کەپێیدەڵێن کرۆک. کرۆک پێکهاتووەلە (١٠ - ١٢)هەرەمی گورچیلە،کەهەرەمین وبنکەکەیان بەرەودەرەوەیەولووتکەکەشیان بەرەوناوەوە. توێکڵی گورچیلەش دەکشێ بەرەونێوان هەردووهەرەمی لەتەک یەک،ئەم پارچەیەی توێکڵیش پێیدەڵێن ستوونەکانی گورچیلە. لەناوهایلەم حەوزی گورچیلەهەیەکەبەشەفراوانەکەی سەرەوەی بۆڕی میزە،حەوزی گورچیلەش دەبێتەدووتاسێ کالێکسی گەورەکەئەمەش دەبێتەدوویان سێ کالیسی بچووک. هەرکالیسی بچووک جۆگەیەکی ڕەحەتی ئاسایە. شایانی باسەکرۆک پێکهاتووەلەبۆڕیچکەی ووردتوێکلیش پێکهاتووەلەتەنۆچکەکانی گورچیلە. تەنۆچکەکانی گورچیلەکاردەکەن بەپاڵاوتنی ئەوخوێنەی بۆیان دێت،پاڵاوتەکەش بەچەندبۆڕیچکەیەک دەڕوات

# Urinary system




کەزۆرخوێ وماددەی پێویست دەمژێتەوەویوریاوماددە پاشەڕۆکانیش دەهێلێتەوەوبەشێوەی میزبۆبۆڕیچکەی گەورەتردەڕۆن (لەناوهەڕەمەکان)ولەلووتکەی هەڕەمەک انەوەدەکرێتەناوکالیکسەکان ویەرەوبۆڕی میزدەڕوات.
خوێن بۆچوون: ٢٥٪ئەوخوێنەی لەدڵەوەبەرەوبەشەکانی لەش دێت بۆگورچیلەکان دەچن. ئەمەش بەهۆی دووخوێنبەری گورچیلەکەلقی شاخوێنبەرن. هەرخوێنبەرێکی گورچیلەدەبێت بەپێنج لق،هەرلقەی بۆبەشێکی تایبەتی گورچیلەدەڕوات. وەبەهۆی خوێنهێنەری گورچیلەوەخوێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کلۆرەخوێنهێنەری خواروو.

## بۆڕی میز:

دووبۆڕی ماسولکەیین (لووسەماسوولکە)و (٢٥سم) درێژن لەگورچیلەوەدەکشێن بەرەوبەشی پشتەوەی میزڵدان. کەمەجوولەی بۆڕیەکانی میزیارمەتیدەرن بۆدەرهاویشتنی میز. لەسێ شوێن بۆڕی میزتەسک دەبێتەوە:یەکەمیان لەشوێنی پێوەلکانی بەحەوزی گورچیلەوە،دووەمیان کاتێ بەلێواری حەوزدەشکێتەوەبەرەوناوحەوز،ئەوی سێیەم کاتێک کەدەچێتەناودیواری میزڵدانەوەلەوسێ شوێنەزۆرجاربەردی گورچیلەدەگیرسێتەوە. بۆڕیەکانی میزیش وەکو گورچیلەلەپشتەوەی پریتۆنیەمن.

## میزڵدان:

میزڵدان کەوتۆتەحەوزەوەبەڵام کاتێ پڕدەبێ لەوانەیەبیتنەناوبۆشایی سکەوە،لەڕسکاوان نیولیتردەگرێ. میزڵدان دیوارێکی بەهێزی هەیەکەپێکدێت لەلووسەماسوولکە. میزڵدان شێوەی گۆڕاوەبەپێ ی ئەوبڕەمیزەی کەتیایەتی. میزڵدان کەبەتاڵەشێوەیەکی هەرمێیی سێ لای هەیەلووتکەکەی لەپێشەوەوبنکەکەی لەدواوەیە. بنکەکەی سێ لایەودووگۆشەکەی سەرەوەی سێ گۆشەکەبۆڕی میزی پێوەنووساوە. گۆشەکەی خوارەوەش جۆگەی





## خوێن بۆچوون:

بەهۆی دووخوێنبەرن خوێنبەری میزڵدانی سەرووخوێنبەری میزڵدانی خواروو. خوێنهێنەرەکانیش تۆڕئاسان ودەڕژێنەناوکلۆرەخوێنهێنەری ناوەوە. شایانی باسەبڵێین میزڵدان بەهۆی لەخۆوەکۆئەندامی دەمارەورۆژێ. سەمپەساوی لووسەماولکەکان خاودەکاتەوەوگوشەری میزڵدان توندەکات ،پاراسەمپەساوی بەپێچەوانەوە.

## جۆگەی میز:

لەمێینەدائەم جۆگەیەکورتەونزیکەی (٤سم)ەولەپشت کونی زێیەوەدەکرێتەوەکەپێیدەڵێن:دەرچەی میزی دەرەوە. لەنێردادرێژترەولەملی میزڵدانەوەدەکشێ تادەرچەی میزی دەرەوەلەبەشی هەرەپێشەوەی چووک،بەشی سەرەوەی جۆگەی میزبەپرۆستات دەورەدراوەبەشێکی بەناوناوپەنچکی میززاوزێ دەڕوات،بەشەکەیتریشی بەناوچووک،کاتێک جۆگەی میز - زاوزێ دادەڕوات دەورەدراوەبەگوشەری جۆگەی میز.

میزی لێدەبێتەوە. بنکەی میزڵدان هاوسێیەلەگەل ڕێکەوتۆواوەچیکلدانە،وەبەشی سەرەوەشی لەگەل بۆشایی پێریتۆنی. شایانی باسەکەبڵێین لووتکەی هەرەمێکی لەخۆگرتووە. لووسەماسولکەی دەرچەمیزی ناوەوەئەستوورەوپێیدەڵێن (( Sphincter Verisicae ))گوشەری میزەڵان.





# نیشانەکانی نەخۆشییەکانی گورچیلەو ڕشتەی میزو میزەڕۆیەکان


و. لەئینگلیزیەوە:
د. ئازاد مستەفا محمود شێروانی زادە


گرینگییەکی زۆرەکەوالەڕێی نەخۆش وەجواب هێنان (History)یەوەلەنیشانەکانی نەخۆشییەکانی گورچیلەکان و میزەڕۆیە - ڕشتەبکۆلرێتەوەچونکەبەهۆی کلینییکە- پشکنین (Physical examination) پیاوبەئاسانی ناگاتە گورچیلەکان،میزکێشەکان وموسڵدان.

. ١سەرەکیترین نیشانەژانەبالەمەرئەم ژانەبدوێین:

١. شوێن:ژانی گورچیلەلەدووناوچەی سەرەکی تەنداهەستی پێدەکرێت:

ا. لەکەلەکە (Loin):بۆشایی بەینی بن دەندەی دوازدەیەمین لەسەرڕا وئێسکی حەوز (Iliac crest) لەژێردا.

ب. لەگۆشەی گورچیلە (Renal angle): گۆشەی نێوان دوازدەمین دەندەوڕۆخی ماسولکەی ڕەقکەری بڕبڕەی پشت (The edge of the erector spinae muscle).

ئاساییەکاتێ لەنەخۆش دەپرسین شوێنەکەی ژانی دیاری بکات بەلەپی دەستی ئامارەبەتەنکێشی دەکات لەگەل دانانی پەنجەی گەورەی دەستی لەسەردڕکە- ئێسکی پێشەوەی سەرەوەی ئێسقانی حەوز.

٢. توندوتیژیی ژانەکە (Severity):
ژانی گورچیلک دەنێوانی ژانێکی تەپ (Dull)وژانێکی جەرگبڕی زۆرتیژڕۆوایە.

٣. سروشتی ژانەکە (Nature of the pain):
زاراوەی (تێرمی) (پێچی گورچیلە)بەکارمەینە. چونکەپێچ ئەوکاتەدێتەکایەوەکەکرژبوون لەدیواری میزکێشدا ڕوودات. ژانەگورچیلک ئەوەندەجێگیرەکەبەدەگمەن هێوردەبێتەوەدەبەینی بروسکاندنەکان.

٢. پێچی میزکێش (Uretric colic):
١ - شوێن (Site): - پێچی میزکێش بەدرێژایی میزکێش هەستی پێدەکرێت. پنتی دەسپێکی پێچەکە



ئاماژەیەکی جێی متمانەیەبۆئاستی میزگیرانەکە. زۆربەی کاتەکان بروسکەکەلەکەلەکەوەدەڕواتەخوارە وەبۆبنکی ئەندامی زاوزێ لەنێراوتاکولێوی ئەندامی زاوزێ لەمێیا.

٢ - دژواریی (Severity):

بروسکاندنی پێچی میزکێش ئەوەندەبەژانەکەنەخۆش دەڵێ ژانەکەم جەرگبڕە. نەخۆش بۆهێورکردنەوەی ژانەکەی پەنادەباتەبەرهاتووچۆکردن یان سووڕدەخوات لەناوجێدا. نەخۆش دەڵێت کەلەم ژانەتوندتری لەژیانانەبینیوە. ژنان دەڵێن ژانەکەلەژانی منداڵبوون دەچێت ئەوەندەدژوارە ژانەکەئارەقەکردنی دەگەڵ دەبێت. زۆران جاریش دڵ تێک هەڵهاتن ورشانەوەشی لەگەڵدایە.

٣ - سروشت (Nature):

میزکێشەپێچ پێچێکی ڕاستەقینەیەکەئازارەکەی (گیرەکی)یە (Griping pain)لەڕووی سروشتەوە. بەشێوەی پێل پێلی (Waves)دێت بۆنەخۆش لەگەڵ ماوەی بێ ژان بوون لەنێوان پێچەکاندا.

٣. میزی خوێناوی (Haematuria):

خوێن لەوانەیەلە (میانی میزکردن یان لەدوامایی میزکردنا)بێ. خوێن بەربوونێکی مامناوەندی ڕەنگەئەوەندەدیارنەبێ بەڵانەکینێ لەوانەیەمیزتۆختریکات لەئاسایی. لەئانی خوێنبەربوونی زۆروزەبەنددەشێت میزببێ بەخوێن. ئەگەر هاتووخوێن لەملی موسڵدان هات یان لەژێراترەوەلەمیزەڕۆئەوساتەنێ کاتێ دەردەکەوێ بەشێوەی میزی خوێنین لەکۆتایی میزکردنداوەک لەنەخۆشی بەلهارزیادا. بەتەواوی وێکەوەنەوەک ژن خوێنی حەیزی بەمیزی خوێنین حەسێوکردبێ. لەبیرشت بێ چەندهۆکارێکی دیکەش هەن میزسۆردەکەن وەکوخوێن وەکوئەم حاڵەتانەدادێن:

ا - زۆرخواردنی سلقەسۆر.

ب- بوونی جاریەجاری هیمۆگلۆبینی لەناومیز(Paroxysmal Haemoglobinuria).

ج - حاڵەتی پۆرفیریا (Porphyria).

د - موسڵدانە- ژان (Vesical Pain):

ژانی موسڵدان ئاسایی ژانێکی تەپی ئەوتۆیەلەبەرزەهارهەستی پێدەکرێ وبەمیزکردن زۆرتردەبێ. زاراوەی خۆگوشین لەکاتی میزکردن بەگوێرەی نەخۆش دەگۆڕێ. هێندێ نەخۆش بۆئەوژانەی کاتی میزکردنی بەکارئەبەن کەلەموسڵدان دەست پێدەکاوبروسکان دەکات بۆمیزەڕۆی دەرێ (Urethria). هێندێ کەبەو ژانەدەلێن لەگەڵ خۆگوشین بۆکردنەدەرەوەی دوادرۆپەکانی میزلەکۆتایی میزکردنداهەستی پێدەکرێ.




٤. زۆرجارچوون بۆمیزکردن (Frequency of micturition):

دەشـێـت ئـەمـەلـەنـەتـوانـیـنـی مـیـزدانـەوەبـێ بۆخۆبەتاڵکردنەوەی تەواوەتی لەهەرمیزکردنێکدایان بـەهـۆی دامـاڵانـی دیـواری نـێـوپـۆشـی میزدا. ئەوکاتەبەهەنددەبێ وەربـگـیـرێ ئەگەرنەخۆش لەخەوکرد. بۆیەکادکتۆردەبێ لەبوونی بەشەودڵنیابێ وڕێژەی میزی شەووڕۆژبزانێ. ئەزیەت دێتن لەکاتی مـیـزکـردن (Dysuria) زۆرجـاران بەکاردەبرێ بۆبوونی ژان لەدەردەمیزەڕۆ (Urethra)،لەکاتی پێداتێپەربوونی میزدا (زوورانەوە لەکاتی میزتندا) وریابەلێت تێکەل نەبێ دەگەڵ ئەو ژانەزگەی کاتی میزتن لەباری هەوکردنی ڕیخۆلەکوێرەداکەبەتەواوی هۆکەی جیایە.

٥. ژانی پرۆستات (Prostatic pain):

ژانی لەپرۆستاتەوەهاتوولەقووڵایی حەوزداهەستی پێدەکرێ،دەنێولاقان لەکۆمداجاریواش لەخوارپشت. بۆنەخۆش بەزەحمەتەبەتەواوی جێگەکەی دیاری بکا. زۆرجـاران نەخۆش وازەن دەبات ژانەکەهی ڕێکە (المستقیم–Rectum)یەتی.

٦. میزگیران (Urinary retention):

مـیـزگـیـران یـان تـیـژەیـان ڤـەکـێـش. لە (تیژ–acute)دامیزلەهێکڕادەگیرێ وژانـی دەگەڵدایە. لە (ڤەکێش=chronic)داموسڵدان گەورەدەبێ وهەڵدەکشێ چ میزبگیرێ یان نەگیرێ.

٧. بـاریـک بـوونـی ڕێــرەوی میز:لەگەورەبوونی پرۆستاتادەبێ.

٨. مـیـزی پچرپچر: لـەبـاری تەسکبوونەوەی دەرەمیزەڕۆ (Urethral stracture) ڕوودەدات هــاورێ لـەگـەڵ تنۆک تنۆک مـیـزدابـەزیـن دوای هەڵسانەوەلەکاتی پاش میزکردنەکە (پاشمین)ی پێدەلێن،حالەتەکەبەخۆگووشین لەکاتی میزکردن باشتردەبێت.

سەرچاوە:

Browses introduction to the symptoms & signs of surgical disease





# Awamedica
*Committed to Quality*




## AwaFedrin

Each tablet contains:
Pseudoephedrine Hydrochloride BP 60 mg and Triprolidine Hydrochloride BP 2.5 mg.
20 tablets.

AwaFedrin is used for the treatment of cough, cold, flu, sneezing, runny or stuffy nose, itchy or watery eyes, hives, skin rash, itching, blocked sinuses and other symptoms of allergies.

Dosage and administration:
Adults and children 12 years and older:
1 tablet every 4-6 hours, or as prescribed by your doctor.




## AwaNelin

Each 5 ml contains:
Diphenhydramine Hydrochloride BP 13,5 mg, Ammonium Chloride BP 131,5 mg, Sodium Citrate BP 55 mg and Menthol USP 1 mg.
100 ml Syrup.

AwaNelin relieves the symptoms of cough and congestion. It also helps relieve runny nose and sneezing associated with hayfever and other allergies.

Dosage and administration:
Adults 12 years and older:
10 ml every 6 hours.
Children 6-12 years:
5 ml every 6 hours.
Or as prescribed by your doctor.

## AwaLergin

Each 5 ml contains contains:
Diphenhydramine Hydrochloride 10 mg.
100 ml Syrup.

AwaLergin relieves the symptoms of allergy and hay fever such as sneezing, runny nose, itchy/watery eyes, itchy skin and hives.

Dosage and administration:
Adults 12 years and older: 12.5-25 ml every 4-6 hours.Maximum 150 ml/day.
Children 6-12 years: 5 ml every 4-6 hours.
Children 1-6 years: 2.5 ml every 4-6 hours.
Or as prescribed by your doctor.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq



# نەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە

د. دڵشادعەبدولرەحمان ڕۆژبیانی
پسپۆڕی نەخۆشیەکانی گورچیلە
ماستەرلەنەخۆشیەکانی گورچیلە
بەشی گورچیلەی دەستکرد
ن. هەولێری فێرکاری/هەولێر

پێناسەی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەچی یە؟
پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەبریتیەلەکرداری نەبڕاوەی لەناوچوونی یەکەی گورچیلە (نیفرۆن).
بۆچی دیاریکردنی وچارەسەرکردنی نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەگرنگە؟
١.بۆدیاریکردنی ئەوهۆکارانەی کەچارەسەریان هەیە.
٢. کەمکردنەوەی یان دواخستنی گرفتە دوایەکان،وە کەمکردنەوەی کاریگەرەکانی لەسەردڵ وبۆرپەکانی خوێن.
قۆناغەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەچین؟
قۆناغەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە بریتین لەپێنج قۆناغی یەک لەدوای یەکی لێک دانەبڕاوکەبە ڕێـژەی کـاری فیلتەری گورچیلە (GFR)دیاری دەکری کەئەوانیش
١-هەرنەخۆشیەکی گورچیلەبەڵام ڕێژەی کاری فیلتەری ئاسایی بێت واتا ٩٠٪ وزیاتر.
٢-ڕێژەی کاری فیلتەری گورچیلەلەنێوان ٨٩ - ٦٠ بێت.
٣-ڕێژەی کاری فیلتەری گورچیلەلەنێوان ٥٩ - ٣٠ بێت.
٤- ڕێژەی کاری فیلتەری گورچیلەلەنێوان ٢٩- ١٥ بێت.
٥ - ڕێژەی کاری فیلتەری گورچیلەکەمترلە١٥٪ بێت یان شووشتنی گورچیلەبکات.
هۆیەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە چین؟
نەخۆشی شەکرە و بەرزبوونی فشاری خوێن گرنکترین هۆکارەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە لە نزیکەی ٦٥٪. توشبوونی گورچیلە درێژخایەنی بە هۆی بەکتریا،گیرانی ڕێڕەوی میز بەهۆی بەرد یان گەورەبوونی پرۆستات لە پیاوان یان گیرانی ڕێڕەوی میز بەهۆی هەر هۆیەک بێت بۆ ماوەیەکی درێژ،نەخۆشیە زگماکیەکانی گورچیلە وەک نەخۆشی کیسی گورچیلە،یان هەوکردنی گورچیلە درێژخایەنی وەیـان هەوکردنی بـۆری خوێن لە هۆکارەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەن.

## ئەوهۆکارانەچین کەدەبنەخێرایی کردنی لەناوچوونی یەکەی گورچیلەوپەککەوتنی؟

ئـەوهـۆکـارانـەزۆرن کـەدەبـنـەخـێـرایـی کردنی لـەنـاوچـوونـی یـەکـەی گورچیلەلەوانە کێشانی جگەرە،بەرزبوونی فشاری خوێن لەگەڵ ڕێژەی شەکرلەخوێن،کەمخوێنی،بەرزبوونی ڕێژەی چەوری لەخوێن،لەگەڵ بەرزبوونی ڕێژەی فۆسفات لەخوێن.

## نیشانەکانی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن کامانەن؟

لەقۆناغەکانی یەکەم ودووەمی پەککەوتنی گورچیلەهیچ نیشانەکی نیەبەڵام لەقۆناغی سێیەمدانەخۆش هەست بە بێتاقەتی دەکات لەبەرکەمبوونی خوێن ومیزکردنی زیادلەشەوان،وەبەرز بوونەوەی ڕێـژەی کریاتینین لەگەڵ بەدەرکەوتنی ئاوی زیادلەلەشدا.
وەلـەهـەمـان کـاتـدارێـژەی ڤـیـتـامـیـن D لەخوێنداکەمدەبێت.
وەلەقۆناغی چوارەمەوەپاشەڕۆکەژەهراویەکان لەلەشداکۆدەبێتەوە وە دەبێتەهۆی نەمانی ئارەزووی خواردن،دڵ تێکچوون لەگەڵ ڕشانەوە وەتێکچوونی ڕێژەی کانزاکان لەخوێندا.
قۆناغی پێنجەم نەخۆش لەباری ناهەمواردایەوەیان شووشتنی گورچیلەی بۆدەکرێ.

## کاریگەری نەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە لەسەر لەشداچین (مچاعفات)؟

گرفتەکانی نەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەلەقۆناغەکانی دوای دووەم دەست پێدەکات وەک گۆڕانەکانی سەرئێسک لەبەرکەمبوونی ڤیتامین D لەخوێندا،کەمبوونی کانزای کالسیۆم وەزیاد بوونی کانزای فۆسفات لە خوێندا.

بەرزبوونی فشاری خوێن لەگەڵ زیادبوونی ئاوی لەش،زیادبوونی کانزای پۆتاسیۆم وکەمبوونی ڕێژەی بایکاربۆنەیت لەخوێندا.

خوێن کەمبوون وخوێن بەربوون لەلەشدالەگەڵ هەوکردنی پەردەکانی ناوەوەی لەش وەهەروەهاکاریگەری لەسەر دەمارەکان وبەدخۆراکی وکاریگەری لەسەرکاری زایندەیی (لاواز بوونی جنس).

بێجگەلەمانەکاری لەسەر کۆئەندامی دڵ وبۆڕییەکانی خوێن زۆرە وەک هەوکردنی دیوارەکانی دڵ لەگەڵ تەسکبوون و ڕەقبوونی دیواری خوێنبەرەکان.

## چۆن چارەسەری نەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەدەکرێت؟

هەرکەنەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەدەستنیشان کراکارپێویستەبۆ کەمکردنەوەودواخستنی زیانەکانی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلەلەگەڵ کەمکردنەوەی زیانەکانی لەسەر کۆئەندامی دڵ وبۆڕییەکانی خوێن وەک

١-قەدەغەکردنی جگەرەکێشان.

٢-کۆنترۆڵکردنی فشاری خوێن ورۆیشتنی پرۆتین لەمیزدابەهۆی کەمکردنەوەی خوێ لەخۆراکداوەلەگەڵ بەکارهێنانی دەرمانی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

٣-بەرزکردنەوەی ڕێژەی خوێن بەبەکارهێنانی دەرزی هۆرمۆنی ئیریسرۆپۆیتین (هۆرمۆنی گەشەی خوێنی) لەگەڵ بەکارهێنانی ماددەی ئاسن وفۆلیک ئەسیدوڤیتامینB١٢ وەک کەرەستەی خاوی دروستبوونی خڕۆکەی سووری خوێن.

٤- کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی شەکرلەخوێندالەونەخۆشانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیەبەهۆی سیستەمی خواردن یان بەکارهێنانی دەرمانی کەمکردنەوەی ڕێژەی شەکرلەخوێن وەک ئینسۆلین و oral hypoglycemic agent

٥-کۆنترۆڵکردنی چەوری خوێن بەهۆی سیستەمی خواردن یان بەکارهێنانی دەرمانی کەمکردنەوەی ڕێژەی چەوری لەخوێن وەک statine.

٦-کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی کانزاکان لەخوێن لەگەڵ کەمکردنەوەی گۆڕانەکانی ئێسک بەهۆی سیستەمی خواردن یان بەکارهێنانی دەرمان وەک کالسیۆم وڤیتامین D.

٧-بەکارهێنانی هەندێ دەرمان بۆپارێزیکردنی دڵ وخوێنبەرەکان لەتەسکبوون ورەقبوونی دیواری خوێنبەرەکان وەک ئەسپرین وبێتابلۆکەر(beta blocker).

٨-ڕاگرتنی کێشی لەش ودابەزاندنی کێشی لەش لەنەخۆشەقەڵەوەکاندالەگەڵ وەرزشکردن.

٩- ڕێکخستنی سیستەمی خواردن وەک کەمکردنەوەی ڕێژەی پرۆتین.

١٠- شووشتن یان چاندنی گورچیلەلەقۆناغی پێنجەم وکۆتایی پەککەوتنی گورچیلە.



# Awamedica
*Committed to Quality*




## Folic Awa

Each tablet contains:
Folic acid BP 5 mg.
30 tablets.

Folic Awa is used for the treatment of anaemia caused by folate deficiency, anaemia during pregnancy, anaemia due to poor nutrition and prevention af anaemia during dialysis.
Dosage and administration:
Adults: 1-3 tablets/day.
Children 1-18 years: ½-2 tablets/day.
Or as prescribed by your doctor.

## Folic Awa ONE

Each tablet contains:
Folic acid BP 1 mg.
60 tablets.

Folic Awa ONE is used for the treatment of anaemia caused by folate deficiency, anaemia during pregnancy and anaemia due to poor nutrition.
Dosage and administration:
Adults:
To prevent Folic Acid deficiency:
1 tablet/day.
To treat Folic Acid deficiency:
2 tablets 2-3 times/day. Can be reduced to 1 tablet/day after 2 weeks.
Children: 1 tablet/day.
Or as prescribed by your doctor.




## AwaPreg

Each sustained release capsule contains:
Dried Ferrous Sulphate BP 150 mg (equivalent to 45 mg of elemental iron) and Folic acid BP 0.5 mg.
30 capsules.

AwaPreg is used to treat anaemia caused by low level of iron or folic acid in the blood. Ferrous sulphate is used to treat iron deficiency anaemia and folic acid is used to produce and maintain new cells. It is especially important during periods of rapid cell division and growth such as pregnancy.
Dosage and administration:
Swallow your capsule whole with a glass of water.
Adults: One capsule a day throughout pregnancy or during lactation. Take AwaPreg on an empty stomach, 1 hour before or 2 hours after a meal.
Or as prescribed by your doctor.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq

# پەککەوتنی لەناکاوی گورچیلە

# (Acute Renal Failure)

بریتییەلەناکاوپەککەوتن وراوەستانی گورچیلەکان،لەماوەی چەندکاتژمێرێک یان رۆژێک یان چەندهەفتەیەک لەئەنجامی کەم بۆچوونی هەوا (ئۆکسجین)وخۆراک بۆگورچیلەکان. ئەمەش بەهۆی دابەزینی فشاری خوێن رووده‌دات بۆماوەیەکی درێژیان لەئەنجامی نەخۆشیەکی لەناکاوی گورچیلەکان رووده‌دات.

## هۆکارەکان:

١-دابەزینی لەناکاوی فشاری خوێن بەهۆی خوێن بەربوون یان لەدەست دانی برێکی زۆری شلەی لەش لەرێگای کۆئەندامی هەرس،وەک:رشانەوەیان رەوانی یان لەرێگای پێست (زۆرئارەقەکردن).

٢-ژەهراوییبوون بەبەکتریا،بەتایبەتی ئەو بەکتریایانەی کە دەبنە هۆی پیس بوونی برین یان پیس بوونی هەندێک جۆری نەشتەرگەری.

٣-نەخۆشیەکانی تورەگۆکانی گورچیلە (Glomerulonephritis) ئەوانەچەندنەخۆشیەکن وهەموویان چارەسەردەکرێن.

٤- ژەهراویبوونی دووگیانی یان خوێن بەربوون لەکاتی منداڵ لەبارچوون یان منداڵ بوون.

٥-کەڵەکەبوونی ژەهرلەناولەشی مرۆڤ لەکاتی رووداویان سوتان.

٦- زۆرتێکشکانی خرۆکەسوورەکانی خوێن.

٧-گیرانی موولوولەخوێنبەرەکانی گورچیلەکان لەئەنجامی خوێن مەیین یان هەوکردنی لەناکاو موولوولەخوێن بەرەکان.

٨- خراپ بەکارهێنانی دەرمان یان بەهەڵەبەکارهێنانی دەرمان.




٩- لەناکاوگیرانی بۆری میز.

١٠-نەخۆشیەزگماکیەکان وەک (پووکانەوەیان تەواو گەشەنەکردن،Dysplasia،Hypoplasia).

## دەرئەنجامی پەککەوتنی گورچیلە:

لەکاتی راوەستانی گورچیلەکان لەکارکردن،ئەمانەرووده‌دات:

١-کەڵەکەبوونی ژەهرەکان:گرنگترین فرمانی گورچیلەکان بریتیەلەکردنەدەرەوەی ئەوژەهرانەی کە لەزیندەکارلێکەکان ناولەش پەیدادەبێت. کاتێک گورچیلەکان تووشی راوەستان دێت ئەوژەهرانەکۆدەبنەوەدەبێتەدیاردەی کۆبوونەوەی یوریا Uremia (کۆبوونەوەی ژەهری میزلەخوێن) کەکاردەکاتەسەرمێشک وبەشەگرنگەکانیتری لەش ودەبێتەهۆی داهێزان ونیشانەکان لەسەردیاردەکەون وتادەگاتەبوورانەوە.

٢-تەواوگەشەنەکردن وهەڵنەدان لەمنداڵان:ئەمەش بەهۆی ترش بوونی خوێن کەمی ڤیتامینD پێویست

بۆدروست بوونی ئێسقانەكان وكەم كاركردنی هۆرمۆنەكان بەهۆی بوونی Uremia،ئەوانە هەمووبەیەكەوە دەبێتە هۆی تەواوگەورەنەبوونی منداڵەكەو لەئەنجامداله ڕولاوازدەبێت.

٣-ئێسكەنەرمەی گورچیله (Renal Rickets) بەهۆی ناڕێكی كاری گورچیلەكان كاردەكاتە سەرتوخمەكان كالسیۆم وفۆسفۆرودواترنیشتنیان لەئێسقانەكان.

٤-كەم خوێنی:لەئەنجامی كەم بوونی هۆرمۆنی ئیرپرۆپۆتین لەخوێن.

٥-زیادبوونی ترش لەناوخوێن:وەگرنگترین نیشانەكان بریتین لە :ڕاڕایی،هەڵچوون،هەناسەدانی خێراوماكیتروەك ناڕێكی لەلێدانەكانی دڵ ومردنی لەناكاو،چارەسەركردنی ئەوبارەبەپێدانی ماددەیەكی تفت دەبێت وەک كاربۆناتی سۆدیۆم.

٦-تێكچوونی هاوسەنگی نێوان توخم وخوێییەكان لەلەشدا.

٧- بەرزبوونەوەی فشاری خوێن:-گورچیلەڕێكخەری سەرەكی فشاری خوێنیمرۆڤەڕاوەستانی،دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

٨-لەوانەیەببێتەهۆی هەوكردنی پەردەی دڵ،لاوازی مێشك وەماریەڵام لەمنداڵان كەمتر ڕوودەدات.

نیشانەكان:

جاری واهەیەكاتێك گورچیلەكان لەناكاوڕادەوەستن نەخۆشەكە هیچ نیشانەیەكی نیەهەتاژەرتە واوكۆدەبێتە وە لە نا وخوێن ئەوكات نیشانەدروست دەكات. هەرچەندهەندێك نەخۆش سەیردەكەن بڕی میزكردنیان كەم بۆتەوە بەتایبەت لەكاتی گیرانی بۆڕی میز كەژان دەیان گرێت. زۆربەی كات نیشانەكان لەڕۆژی چوارەم یان پێنجەم لەڕاوەستانی گورچیلەدەست پێدەكات.



نیشانەکان،ئەمانەن:

١- خێرابوونی هەناسەدان: بەهۆی ترش بوونی خوێن نەخۆش هەندێک جارهەست بەتەنگە نەفەسی دەکات لەئەنجامی گیرانی سییەکان یان هەست بەئازاردەکات لەکاتی هەناسەدان بەهۆی هەوکردنی پەردەی سییەکان.

٢-دەست وپێ سڕبوون ومێروولەکردن،لەگەڵ لەرزین ورەق بوونیان.

٣- سەرسووڕان وپشێوی لەبیرکردنەوەوخەواڵووبوون،بوورانەوەولەخۆچوون.

٤- زیادلێدانی دڵ ونارێکی لەلێدانی دڵ وژانەدڵ.

٥-ووشک بوونەوەی پێست ورووکەشەشانەکانی ناوپۆشی دەم وهەوک.

٦ -گۆڕانی ڕەنگی پێست وەک خۆڵی لێدێت،لەوانەیەناوەناوەقانی سپی لەسەردەست ودەم و چاودەربکەوێت.

*دیاریکردن:- ڕاوەستانی لەناکاوی گورچیلەکان لەسەرەتاهەستی پێناکرێت. تاکاری گورچیلەکان دەگات بە (٢٥٪)ئەوکات نیشانەکان بەدەردەکەون کە پزیشک پێی ئاشنایە،پشکنینی خوێن و کریاتینین ویوریادەکات دەبینێت بەرزبووەتەوە. کاتێک درەنگ دیاری دەکرێت زانینی هۆکاری پەککەوتنەکەزەحمەت دەکەوێت.

*چارەسەرکردن:

پەککەوتنی لەناکاوی گورچیلەچارەسەری هەیەونەخۆش تەواوچاک دەبێتەوەبەدەرمان وچاودێریکردن. هەندێک جارنەبێت کەهۆکاری پەککەوتنی گورچیلەبەهۆی گیرانی ڕێڕەوەکانی میزەوەدەبێت،لەو کا تا نە دا پێو یستە نە شتە رگە ری بۆبکرێت. وەهەندێک لەوانەی پەککەوتنی گورچیلەکەیان بەهۆی بەرگری لەخۆوەیە کەپێویستیان بەماددەکۆرتیزۆنەکان دەبێت. بۆتەواوچاک بوونەوەپێویستیان بەچەندرۆژێک یان چەندهەفتەیەک دەبێت. زۆربەی کات مردن لەوکەسانەدابەهۆی ژەهراوی بوون بەکاردانەوەلاوەکیەکانی دەرمان دەبێت. لێرەداسوودی گورچیلەی دەستکردبەشووشتنی گورچیلەبەرێگای زگ دەردەکەوێت،بۆلابردنی ژەهرەکەلەلەشی نەخۆشەکەتاتەواوچاک بوونەوەی گورچیلەوگەڕانەوەی بۆژیان. بینراوە ( ٩٥٪ ) لە پە ککە وتنی گورچیلەتەواوچاک دەبنەوە.



# میزی پرۆتیناوی



د. داوود حەسەن ڕەمەزان
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی گورچیلە
یەکەی گورچیلەی دەستکرد
نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری

میزی پرۆتیناوی: بریتیەلەکۆمەڵێک نیشانەکەلەنەخۆش بەدیاردەکەوێت وەک بوونی پرۆتین لە میززیاترلە (۳،٥gm/dl)،دابەزینی ڕێژەی پرۆتین لەخوێن،بەرزبوونەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆل وچەوری سیانەTGلەخوێن وهەروەهائاوسانی لەش.

## هۆیەکانی

ا- هۆی سەرەکی (سەرەتایی) Primary

۱. باوترینیان لەمنداڵ(گۆرانی کەم لە پەردەی ناوپۆشی گورچیلە) Minimal change disease

۲. باوترینیان لەگەورەکان (گۆڕانی تەواو لە پەردەی ناوپۆشی گورچیلە) MembranousGN

۳. ئەستووربونی پەردەی ناوپۆشی گورچیلە GN Membranoproliferative

٤. (ئەستووربون و ڕەقبوونی پەردەی ناوپۆشی گورچیلە)Membranous prolifrative Gulomerusclerosis

ب- هۆی دووەمی (لاوەکی)،لەوانە:

۱- هەوکردن:Infectionنموونەهەوکردنی جگەری ڤایرۆسی،هەوکردنی قورگ (Strept. throat)

۲- بەکارهێنانی هەندێک دەرمان:وەک (Gold،Pencillamine،Captopril).

۳- شێرپەنجە .(Cancer).

٤- هۆی بۆماوەیی .(Alport disease).

٥-نەخۆشی بەرگری.(Immune disease).

٦-ئەونەخۆشیانەی درێژخایەنانەی کەکاردەکاتەسەرزۆربەی ئەندامەکانی لەش وەک نەخۆشی شەکرە،دەردەگورگ (SLE)

# Nephrotic Syndrom

وشـــێـــرپـــەنـــجـــەی (M.M).
ونەخۆشی (Amyloidosis).
نەخۆشی میزی پرۆتیناوی هەمووتەمەنێک تووشی دەبێت،لەمندال زۆرباوتردەبێت لەنێوان تەمەنی دوو بۆ شەش سال وهەروەهاکەمێک ڕێژەی زیاترەنێروەک لەمێ.

• - نیشانەکانی:
ئاوسانی لەش کەباوترینیانەلەوانەیەدەربکەوێت لەدەم وچاوپێی ودەست یان سک.
نیشانەیتروەک:میزی کەفاوی دەبێت،زیادبوونی کێشی لەش،کەمبوونەوەیئارەزووی خواردن، بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

*پشکنینەتاقیگەییەکان:
١-فەرمانەکانی گورچیلە ( .Blood Urea،S .(Creatinine
٢-ڕێژەی پاککردنەوەی کریاتین لەمیز (Creatinine .(Clearance
٣ - ڕێژەی Albuminلەخوێن.
٤ - ڕێژەی چەوری لەخوێن (S. cholestrol).
٥-پشکنینی میـزGUEدەرکـەوتـنـی ڕێژەیەکی زۆرلەپرۆتین لە میزوهەروەهاچەوری لە میز.
٦-پشکنینی شـانـەیـی گـورچـیـلـە (Kidney Biopsy)لەوانەیەپێویست بێت.



هەروەهاچەندتاقیکردنەوەیەک لەوانەیەپێویست بکات بۆزانینی هۆی نەخۆشیەکەوەک:

• - پشکنینی شەکرە.
*پشکنینی (Cryoglobulin)، (ANA).
چارەسەرکردن:
مەبەست لـەچارەسـەرکـردن ئەوەیەنیشانەکانی نەخۆشیەکەنەهێلی،ڕێگالەبەردەم ماکەکانی بگرێت وەهەروەهابەربەست بگرێت لەبەردەم سست بوونی گورچیلەکان.
چارەسەرکردنی ئەونەخۆشیانەی کەبۆتەهۆی میزی پـرۆتـیـنـاوی (Nephrotic Syndrome) وەهـەنـدێـک جارنەخۆشەکەواپێویست دەکات هەمووژیانی دەرمان وەربگرێت.
١-چـارەسـەروکـۆنـتـرۆلـکـردنـی فـشـاری خوێن کەزۆرگرنگە،پێویست دەکـات فـشـاری خوێنی نەخۆشەکە ٨٠/١٣٠ یان کەمتربێت بەهۆی بەکارهێنانی دەرمان باشترینیان (ACE inhibitor،ARB) وەهەروەهائەم دووکۆمەڵەدەرمانەڕێژەی پرۆتینیش لەمیزکەم دەکاتەوە.





٢-كورتيكوستيرۆيدوهەندێک دەرمانیترکەبەرگری لەش کەم دەکەنەوە (Immune Suppresive therapy)لەوانەیەلەنەخۆشیەکەبەکاربهێنرێت.

٣-بەکارهێنانی ئەودەرمانانەی کەرێژەی چەوری لەخوێن کەم دەکەنەوەوەک (statin group) کەگرنگەبۆکەمکردنەوەی مەترسی نەخۆشی دڵ و بۆریەکانی خوێن.

٤-کەمکردنەوەی خوێ لەچێشت وبەکارهێنانی ئەودەرمانانەی کەمیزی زۆری پێدەکەیت (Diuretics)بەسوودەبۆکەمکردنەوەی ئاوسانی لەشی نەخۆشەکە.

٥ -زۆرکەمکردنەوەی پرۆتین لەخواردن لەوانەیەبەسوودبێت وهەندێک بەسوود نەبێت. واباشترەبەرێژەی مام ناوەندی پرۆتین بخورێت بۆنموونە. (١gm/day)

•-هەندێک دەرمان لەوانەیەبەکاربهێنرێت لە نەخۆشیەکە لەوانەیە (Vit.D) و دەرمانی شل کردنەوەی خوێن وەک (Heparin).

**•-ماکەکانی نەخۆشیەکە:**

١- رەق بوونی لوولەکانی خوێن ونەخۆشی دڵ.

٢- خوێن مەیین لەبۆریەکانی خوێن گورچیلە.

٣- سست بوونی گورچیلەکان.

٤-هەوکردن لەلەش وەک هەوکردنی سیەکان وپەردەی پریتۆن.

٥- بەدخۆراکی

٦-کەڵەکەبوونی ئاولەلەش (Pulmonary Oedema).

**خۆپارستن:**

رێگاگرتن لەنەخۆشیەکەتەنهابەچارەسەری تەواوی ئەم نەخۆشیانەدەبێت کەدەبێتە هۆی نەخۆشی میزی پرۆتیناوی (Nephrotic Syndrome).

# ©Awamedica
*Committed to Quality*




## AwaLodipin 10

Each tablet contains:
Amlodipine Besilate BP equivalent to
Amlodipine 10 mg.
30 tablets.

AwaLodipin 10 belongs to a group of medicines called calcium-channel blockers. It is used for the treatment of high blood pressure, angina and blocked arteries of the heart.

Dosage and administration:
Adults: 1 tablet/day, or as prescribed by your doctor.




## AwaTrombin

Each enteric-coated tablet contains:
Aspirin (acetylsalicylic acid) BP 75 mg.
30 tablets.

AwaTrombin is an antiplatelet drug which prevents blood clots particularly in atherosclerosis and angina. It also reduces the risk of heart attacks and strokes in patients with a previous history of these conditions, when taken regularly.

Dosage and administration:
Adults: 1-2 tablets/day, or as prescribed by your doctor.




## Awagra

Each film-coated tablet contains:
Sildenafil Citrate equivalent to Sildenafil 100 mg.
4 tablets.

Awagra is used for the treatment of erectile dysfunction in men.

Dosage and administration:
½-1 tablet, one hour before sexual activity. Maximum once daily, or as prescribed by your doctor.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq

# تەسکبوونی خوێنبەری گورچیلە

# RENAL ARETERY STENOSIS

د. زانا تەوفیق باڵەکی
ماستەر لە نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ

تەسکبوونی خوێنبەری گورچیلەبریتیەلەدیاردەی تەسکبوون یان گیرانی یەکێک یان هەردووخوێنبەری گورچیلە. هەرگورچیلەولەڕێگای خوێنبەرێکەو ەکەیەکسەرلەشاخوێنبەرەوەدەردەچێت خوێنی بۆدەچێت. دڵ لەیەک خولەکدابڕی٥لیترخوێن بۆلەش پاڵدەنێت ولەوبڕەخوێنەنزیکەی (١- ١. ٥) کەدەکاتە٪٢٥ئەوخوێنەی لەدڵەوەپاڵی پێوەدەنرێت بۆگورچیلەکان دەچێت. گیران یان تەسکبوونی یەک یان هەردووخوێنبەری گورچیلەدەبێتەهۆی کەمچوونی خوێن بۆگورچیلەکان ولە ئەنجامدادروستبوونی گۆڕانکاری لەکیمیکەکارلێکەکانی ناولەش وکرداری هۆرمۆنەکان. بەرجەستەبوونی ئەوگۆڕانکاریانەلەسەرشێوەی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن یان تووشبوون بەخراپ کارکردنی گورچیلەکان یان نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەکان.

*هۆکارەکانی تووشبوون:

١.بەهۆی دروستبوونی قەتماغەلەناوولەسەردیواری مووڵوولەخوێنبەرەکان کەزۆرجاریەشێک دەبێت لەڕەقبوون وتەسکبوون وڕەقبوونی هەمووموولوولەخوێنبەرەکانی لەش. هۆکارەکانی تووشبوون بەڕەقبوونی خوێنبەرەکان وەک:زۆربوونی ئاستی چەوری ناوخوێن وبەرزبوونەوەی فشاری خوێن وتەمەن ونەخۆشی شەکرەوجگەرەکێشان،هەمووئە وهۆکارانەبوونیان ئەگەری تووشبوون بەڕەقبوونی خوێنبەرکان وبەتایبەتی خوێنبەرکانی دڵ وهەروەک ئەوانیش خوێنبەرەکانی گورچیلەزیاددەکات.

٢.بەهۆی نەخۆشیەکی زگماکی لەپێکهاتەی دیواری موولوولەخوێنبەرەکان (خراپ دروستبوونی ماسولکەکانی دیواری موولوولەخوێنبەرکان)کەدیواری موولوولەخوێنبەرکان ئەستووردەبێت وتیرەی خوێنبەرەکەبچووک دەبێتەوە (STENOSIS). یان بەهۆی هەوکردنی دیواری موولوولەخوێنبەرکان (VASCULITIS)یان بەهۆی تەقینێک یان قڵیشێک لەدیواری موولوولەخ وێنبەرەکان (ANEURYSM).

*نیشانەکانی:

زۆرجارهیچ نیشانەیەکی نیە. ئەوکات دەردەکەوێت کەکەسەکەتووشی تووشی تەسکبوونی خوێنبەری گورچیلەبووەکاتێک پشکنینی بۆدەکرێت کەتووشی نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن بووەبۆزانینی هۆکارەکانی یان ئەونەخۆشانەی گورچیلەکەیان باش کارناکات وپشکنینیان بۆدەردەکرێت دەردەچێت کەتووشی نەخۆشی تەسکبوونی خوێنبەرەکانی گورچیلەبووە. پزیشک کاتێک بیری بۆبوونی ئەم نەخۆشیەدەچێت:

١. فشاری خوێنی زۆرکەبەدەرمان کۆنترۆل نەکرێت.
٢. فشاری خوێنی زۆرلەکەسێک کەتەمەنی لەسی ساڵ کەمتربێت یان تەمەنی لەپەنجاساڵ گەورەتربێت.
٣. سۆناربۆکەسێک بکرێت ویەکێک لەگورچیلەکانی بچووک بێت وئەویترئاسایی بێت.

***دیاریکردن:**

پزیشک زۆرکات لەکاتی بینینی نەخۆش مەزەندەبۆبوونی ئەودیاردەیەدەبات. کاتێگ لەپشکنینی زگ لەکاتی گوێگرتن بەبیستۆک (سماعە)گوێبیستی هەرایەک دەبێت (bruit)بەتایبەتی لەسەرشوێنی تەسک بوونەوەکە. دەتوانرێت تیشکی ڕەنگاوڕەنگی موگناتیسی بۆخوێنبەرەکانی گورچیلەبکرێت وبەهۆیەوەشوێنی تەسک بوونەوەکەدەست نیشان بکرێت. هەروەهائەگەرسۆناربۆنەخۆشەکەبکرێت ئەواقەبارەی گورچیلەکان دەبینرێن کەزۆربەی کات بچووکن بەهۆی کەم چوونی خوێن بۆگورچیلەکان. دەتوانرێت تیشکی ڕەنگاوڕەنگی خوێنبەرەکان بکرێت بۆدیاریکردنی شوێنی تەسک بوونەوەکە.

***چارەسەرکردن:**

یەکەم ئامانج لەچارەسەرکردنی ئەونەخۆشیەئەوەیەکەبەرزبوونەوەی فشاری خوێن کۆنترۆل بکرێت وخوێن بۆگورچیلەکان بچێت.

چارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن بەپێدانی دەرمانی چارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن دەبێت. بۆتەسک بوونەوەکە:نەشتەرگەری بەکاردێت بۆفراوانکردنی دیواری موولوولەخوێنبەرەکە. جاری واهەیەپزیشک بالۆن بۆنەخۆشەکەدەکات.

لەڕێگای یەک لەخوێنبەرەکانی لاق،پزیشک بالۆنەکەدەبات تادەگاتەخوێنبەری گورچیلە و ئەوشوێنەی تووشی تەسکبوونەوە بووە پاڵدەنێت، بۆ ئەوەی دیواری موولوولەخوێنبەرەکەبکرێتەوەوتەسکبونەوەکەی نەمێنێت. هەندێک پزیشک بەنەشتەرگەری ئەوپارچەیەی موولوولەخوێنبەرەی کەتەسک بووەتەوەولەناوچووەبەنەشتەرگەری لێدەکاتەوەوفڕێی دەدات .دواترموولوولەخوێنبەرەکەدەدوورێتەوە. زۆردەگمەن پزیشک ناچاردەبێت گورچیلەکەبەتەواوی لابدات ودەریبکات بۆئەوەی نەخۆشەکەتووشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن نەبێتەوە.





# هەوکردنەکانی میزەڕۆ لە ئافرەتی دووگیان

د. خاوەرئەحمەدموستەفا
ماستەرلەنەخۆشیەکانی ئافرەتان ومنداڵ بوون
پسپۆڕی نەخۆشیەکانی ئافرەتان ومنداڵ بوون
نەخۆشخانەی مێرگەسۆری گشتی/مێرگەسۆر

ساڵانەدەیەهاملیۆن کەس لەسەرانسەری جیهانداتووشی هەوکردنەکانی ڕێرەوی میزەدەبن لەهەمووچین وتەمەنەکان (منداڵ وپیاووئافرەت وپیر) بەڵام ئافرەتان زیاترلەپیاوان تووشی هەوکردنەکانی ڕێرەوی میزەدەبن (التهاب المجاری البولیه). بەتایبەتی کاتێک لەوپەڕی گەنجیداولەتەمەنی زاوزێدان وهەروەهالەکاتی دووگیانی. ئافرەتان دەئەوەندە زیاترلەپیاوان تووشی هەوکردنەکانی ڕێرەوی میزەدەبن،هەرلەبەرئەوەدەتوانرێت هەوکردنەکانی ڕێرەوی میز بەنەخۆشیەکی ئافرەتان دابنرێت.

*هۆکاری زیاترتووشبوونی ئافرەتی دووگیان بەهەوکردنەکانی ڕێرەوەکانی میز؟

١- هۆکارەکەی دەگەڕێتەوەبۆپەنگخواردنی میزلەڕێرەوەکانی میزکەلەکاتی دووگیانی ڕوودەدات. کەدەبێتەهۆی زیادبوون وزۆربوونی میکرۆب و ناوەندێکی چاک دەبێت بۆچالاک بوونیان ولەئەنجامداتووشبوون بەنەخۆشیەکانی ڕێرەوەکانی میز. هۆکاری پەنگخواردنی میزلەکاتی دووگیانی دەگەڕێتەوەبۆخراپ کارکردنی ماسولکەکانی ڕێرەوی میزکەفەرمانیان دەورپێنینەلەدەرکردنی میزبۆدەرەوە. بەهۆی کاردانەوەی هۆرمۆنەکان لەکاتی دووگیانی کەدەبێتەهۆی تەمبەڵی لووسەماسولکەکانی ڕێرەوەکانی میز.

٢ - گیران وپاڵەپەستۆخستنەسەربۆڕی میزبەهۆی ویلداش ومنداڵدان کەگەورەبوونەلەئەنجامداقەتیس بوونی میزلەحەوزی گورچیلە.

٣-فشارخستنەسەرمیزڵدان بەهۆی منداڵدان کەگەورەبوولەئەنجامداپەستان دەخەنەسەرمیزڵدان.

٤- پەنگ خواردنی میزلەوئافرەتانەزۆرترەکەتەمەنیان بەناوساڵداچووەودووگیانن (بەهۆی گەورەبوونی قەبارەی منداڵدان وکاردانەوەی هۆرمۆنەکان). هەروەها پەنگخواردنی میزئەوکاتانەش ئەگەری زۆردەبێت کەپێشترئافرەت گیروگرفتیشی هەبێت لەڕێرەوی میز (وەک بەردی گورچیلە ،تەسکبوونی دەرگای بۆڕی میز).

* جۆرەکانی هەوکردنی ڕێرەوەکانی میزلە ئافرەتی دووگیان؟

هەوکردنەکانی ڕێرەوی میز چەند جۆرێکی هەیە : لەوانەیە میزی پڕمیکرۆب بێت ونیشانەی نەبێت یان تووشی هەوکردنی میزڵدان بێت یان تووشی هەوکردنی حەوزی گورچیلەبێت یان تووشی هەوکردنی گورچیلەبێت. ئەوەی پێویستەباس بکرێت کاتێک

باسی هەوکردنەکانی ڕێڕەوی میزدەکرێت،زۆربەی هاوولاتیان پێیان یەک نەخۆشیەوکەچی لە ڕاستیدا چەند نەخۆشیەک دەگرێتەوەو چارەسەرکردنیشیان جیاوازە وماوەی چارەسەرکردن لە نەخۆشیەکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێت. هەوکردنەکانی ڕێڕەوی میزلەئافرەتی دووگیان ئەگەرهاتووزوودیاریکراوچارەسەری زووکرائەوائاسان دەکەوێت بەڵام ئەگەردرەنگ دیاری بکرێت وچارەسەروەرنەگرێت،لەوانەیەماک لەسەرکۆرپەودایکەکەدروست بکات.

• **ماکەکانی هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میزلە ئافرەتی دووگیان؟**

ماکەکان پەیوەندی بەدووان دەبێت ویەکێکیان کۆرپەوئەویدیکەیان دایکەکەیە.

ا- ماکەکان لەسەرکۆرپە؟

١.زوولەدایک بوون (کەلەوانەیەکۆرپەکەبەناکامی لەدایک بێت).

٢.لەوانەیەمنداڵەکەکاتی لەدایک بوونی کێشی لەشی کەم بێت (IUGR).

٣. کۆرپەکەلەکاتی لەدایک بوونی گیان لەدەست بدات.

ب- ماکەکان لەسەردایک؟

١. چوونی هەوکردنەکەبۆناوخوێن وتووشبوون بەژەهراوییبوونی خوێن.

٢. دروست بوونی کێم لەگورچیلە.

٣.لەوانەیەدایکەکەتووشی ژەهراویبوونی دووگیانی بکات،هەرلەبەرئەوەیەهەموو کات سەردانی پزیشکی ئافرەتان دەکرێت لەکاتی دووگیانی بەشێوەیەکی ڕۆتینی پشکنینی میزبۆبکات کەپشکنینێکی ئاسانەوبەتایبەتی ئەگەرنیشانەکانی هەوکردنەکانی ڕێڕەوی میزی هەبوو:وەک میزسۆتانەوەوزۆرمیزکردن و... هتد).



*هەوكردنی میزی پڕمیكرۆب چییە؟

بریتییەلەبوونی میكرۆب لەناومیزبێئەوەی هیچ نیشانەیەك دروست بكات. ئەوهەوكردنەنزیكەی ٥٪ لەئافرەتان تووش دەبن. بەڵام لەئافرەتی دووگیان زیاترەوبوونی ئەودیاردەیەلەئافرەتی دووگیان ئەگەری تەشەنەكردنی زۆردەبێت. زۆربەی كات لەكاتی بوونی هەوكردنی میزی پڕ میكرۆب لەئافرەتی دووگیان دەبێت چارەسەربكرێت.

*نیشانەكانی هەوكردنەكانی ڕێڕەوی میزلەئافرەتی دووگیان؟

١- میززوورانەوەوزۆرمیزكردن وزۆرهاتن بۆمیزكردن وبۆنی ناخۆش لەمیزدێت.

٢- ئەگەرئافرەتەكە چارەسەری نەكردونەخۆشیەكەی تەشەنەی كردتووشی هەوكردنی حەوزی گورچیلەبوونەوكات نیشانەیەك: بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش وتالێهاتن دەبێت ولەوانەیەلەرزی بێتێ وهەردووتەنكێشی ئێش وئازاری هەبێت،تووشی ژانی گورچیلەبێت ولەوانەیەڕشانەوەوبوورانەوەی هەبێت

*چارەسەر:

١-لەكاتی بینینی هەرنیشانەیەكی هەوكردنەكانی ڕێڕەوەكانی میزدەبێت سەردانی پزیشكی تایبەتمەندی ئافرەتان بكات. پزیشك پشكنینی میزی بۆدەنووسێت (GUE) كەپشكنینێكی ئاسانەوبەماوەیەكی كەم دەكرێت. جاری واهەبووەپزیشك پێویستی بەچاندنی میز هەیە (زرع البول)بۆدۆزینەوەودیاریكردنی ئەودژەزیندەگیەی كەدژی بەكتریاكەی بووەتەهۆی هەوكردنەكەكاردەكات پێدەدۆزێتەوە.

٢-كاتێك پزیشك دیاریدەكات ئافرەتەكەتووشی هەوكردنی حەوزی گورچیلەبووەئەواشورنقەی بۆدەنووسێت ئەوەگرنگەكەبەگوێرەی ڕێنماییەكان دەرمانەكان بەكاردێت وچەندرۆژێت بۆنووسرابووئەوەندەڕۆژەبەكاربێن ەولەخۆوەڕامەگرەچونكەلەوانەیە دووبارەسەرهەڵ بداتەوە. دوای تەواوكردنی چارەسەرەكەسەردانی پزیشك بكەرەوە بۆئەوەی دووبارەبتبینێتەوەپشكنینی ترت بۆبكات تابزانێت تەواو چاك بوویتەوە.



# گورچیلەو دووگیانی

دووگیانی بارێکی فەسلەجییەونەخۆشی نیە ،چەندگۆڕانێکی هۆرمۆنی وجەستەیی بەسەرئافرەت دادێت .گرنگترین کاردانەوەفەسلەجیەکانی دووگیانی لەسەرگورچیلەکان،بریتیەلە:

١-لەژێرکارتێکردنی هۆرمۆنەکانی دووگیانی،قەبارەی گورچیلەکان بەڕێژەی ١سم یان زیاترگەورەتر دەبێت .حەوزی گورچیلەوکرۆک وبۆڕی میزکشانیان دەبێت .بڕی میزی فلتەرکراویەڕێژەی (٢٥-٤٠٪)زیاددەبێت .چڕی شلەکان گۆڕانی بەسەردادێت .ڕێژەی خاوێنکردنەوەی ترشی یۆریک Uric acidدووهێنددەبێت وبڕی میزتنی شەکرلەگەڵ میززیاددەبێت بەڵام ئاستی ڕێژەی شەکر لەناوخوێن هیچ گۆڕانکاری بەسەرداناپەت.

٢-پشکنینەکان:-ئەوئەستووربوون وگەورەبوونەی ڕێڕەوەکانی میزئاساییەوبەنەخۆشی دانانرێت. پشکنینی چالاکی گورچیلەکان (S. creatinineو (BUN)کەمێک کەمدەکات .کریاتینین لە ٨mg/dl ,٠ وبوریالە ١٢mg/dl دەبێت .ڕێژەی بیکاربۆنات لەخوێن (٤-٥meq/l)وکەمترلەوەی پێشی دووگیانی .هەروەهاڕێژەی خوێ ی سۆدیۆم لەناوخوێن بەبڕی٥meq/l کەمتردەبێت لەڕێژەکەی پێش دووگیانی .ڕێژەی خوێی ترشی یوریک لەناوخوێن کەم دەبێتەوە بۆ (٣-٤mg/l) .ڕێژەی لەناو٢٤سەعات میزنزیکەی (٢٠gm) وپائافرەتەکە نەخۆشی شەکرەیشی نەبێت.

## ژەهراویبوونی دووگیانی
## Preeclampsia-eclampsa
## (toxemia of pregnancy)

ئەم نەخۆشیەبەتەواوی بەڵام بەتایبەت نانەخۆشی ئەوئافرەتانەن کەیەکەم زگیانەودووگیانن بە نۆبەرەکانیان .ژەهراویبوون دووگیانی (Preeclampsia)بریتیەلەدیاردەی بوونی:-

١-بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

٢-میزی پرۆتیناوی:بوونی پرۆتین لەمیز (Proteinuria).

٣- ئەستووربوون وپەنمان (Edema).

٤-جارجاریش بەتایبەتی لەکاتی توندی،کەم خوێنی بەهۆی تێکشکانی خڕۆکە سـوورەکـان (Microangiopathic H.Anaemia)دەبێت کەدەبێتەهۆی تێکشکان وخراپ کارکردنی موولوولەخوێنبەرەکان .گرنگترین نیشانەش بریتیەلەگەمەکردنی فشاری خوێن،ئەمەش بەهۆی هەستەوەری موولوولەخوێنبەرەکان بۆگرژبوونی موولووله خوێنبەرەکان،وەک ( (Catecholamine فشاری خوێن چەندخوێندنەوەیەکی دەبێت .بەڵام فشاری خوێنی بەرزبۆ (٤-٦)کاتژمێریەکسەرئەونەخۆشیە دیاریدەکات. ئەگەرئەودیاردەیەدایکەکەگەشکەی بۆهات لەخۆچوو،ئەوکات دەووترێت:دایکەکە تووشی ژەهرایبوونی تەواو ( (Eclampsia)بووە.

*پشکنین:

پشکنینی گورچیلەبەتایبەتی ئەگەرسەیری شانەیەکی گورچیلەبکەین کەدەبێتەهۆی زیادبوونی ڕووکەشەشانەی کرۆکی گورچیلەکان ولەگەڵ هەڵئاوسانی خانەکانی ڕووکەشەشانەکان بەڵام ژمارەی خانەکان زیادناکات .لەوانەیەبۆشایی بکەوێتەنێوانیان.

*نیشانەکان:

یەکەم نیشانەلەوانەیەسادەیان تووندبێت .هاتنی ئافرەتێکی دووگیان کەیەکەم دووگیانیەتی وفشاری خوێنی بەرزە .مانگەکانی کۆتایی دووگیانیەکەیەتی ئەوەئەگەری تووشبوونی بەودیاردەیەزیاددەکات .ئەگەرئەودیاردەیەچارەسەرکرائەواووردەووردەتیردەبێت، دایکەکەتووشی گەشکەدەبێت،لەوانەیەتووشی پەککەوتنی لەناکاوی گورچیلەومردن بێت.

*چارەسەرکردن:-بەنوواندنی نەخۆش لەنەخۆشخانەوحەوانەوەی نەخۆشەکەویارمەتیدانی لەدایک بوونی کۆرپەکەی بەتایبەتی ئەگەرماوەی خۆی تەواوکردبوو .لەگەڵ دانی دەرمانی وەک (Magnesium Sulfate)بۆئەوەی نەوەک دایکەکەتووشی گەشکەبێت .بەئەسپایی هێنانە خوارەوەی فشاری خوێن بۆڕێژەی (٩٥-١٠٥mg/l)بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەبیت ئەودەرمانانە نەدەیت بەدایکەکە،کەکاردانەوەی لاوەکی لەسەرکۆرپەکەدروست بکات،وەک ئەودەرمانانەی کەمیزی زۆرپێدەکات (Diuretis).

سەرچاوە:

١-Davidsons Principles&practice of medicine، ٢٠١٠.
٢-Medicine، ١٩٩٧.



# نەخۆشیەکانی دڵ ونەخۆشیەکانی گورچیلە

د. ئازاد مەنتک
پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ

لەگەڵ ئەوەی گورچیلەودڵ فەرمانیان لەگەل یەکتری جیاوازەوهەریەکەیان ئەندامێکی دووکۆئەندامی جیاوازن بەڵام لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووەکەپەیوەندی بتەووڕاستەوخۆیانبەیەکتریەوەهەیە . هەرکاتێک یەکێکیان نەخۆش بکەوێت ئەوامەترسی نەخۆش کەوتنی ئەویتریان زیاددەکات. هەرئەمەش وای لەهەندێک لەپزیشکان کردووەکە: وەسفی نه خۆ شیه کا نی دڵ ونەخۆشیەکانی گورچیلەبەوەبکەن کەبریتین لەدووجمکەترسناکەکە . تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ مەترسی تووشبوون بەنەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەزیاددەکات. بۆنموونە:لێکۆلینەوەک لەم دواییەدادەریخستووەکەلە ١٣٨٢٦کەس کەنەخۆشی دڵیان هەبوولەوانە ٥٤٪مەترسی نەخۆشی گورچیلەیان هەبوو. هەرلەبەرئەوەبۆپاراستنی گورچیلەکان دەبێت هەنگاوەکانی خۆپاراستن لەنەخۆشیەکانی دڵ پیادەبکرێت.

لەگەل ئەوەی زۆربەی پزیشکان ئەوەیان لاڕوون بوو:کەنەخۆشیەکانی دڵ مرۆڤ تووشی مەترسی تووشبوون بەنەخۆشیەکانی گورچیلەدەکات بەڵام ئەوەیشیان بۆڕوون بووەوەکەبەپێچەوانەش ڕاستە . کەواتەنەخۆشیەکانی گورچیلەهۆکارێکی مەترسیدارەبۆتووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ ومووللوولەخوێنبەرەکان ونۆرەی دڵ وپەککەوتنی دڵ. لەگەل خراپ کارکردن وتێکچوونی گورچیلەکان مەترسی نەخۆشیەکانی دڵ زیاددەبێت. بەگوێرەی دیراسەیەکی هۆڵەندی دەرکەوتووە:کەهەرکەمکردنێک لەڕادەی دەڵاندن لەتوورەگەکانی گورچیلە (GFR)ئەگەری تووشبوون بەنۆرەی دڵ بەڕێژەی ٣٢٪زیاددەکات بەڵام ئەگەرکەسەکەلەناکاوڕادەی دەڵاندن لەتورگەکانی گورچیلە (GFR) کەم بکات لەوانەیەببێتەهۆی مردن بەهۆی نەخۆشیەکانی دڵ. نیشانەیەکتری نەخۆشیەکانی گورچیلەبریتیەلەبوونی پرۆتین لەمیز. ئەوەش نیشانەیەکی گرنگی نەخۆشیەکانی دڵە. هەتائەگەرهاتووبەڕێژەیەکی کەم پرۆتین لەمیزهەبێت مەترسی زۆرەبۆتووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ وهەرچەندپرۆتین لەمیززۆربێت مەترسی نەخۆشیەکانی دڵ زیاددەبێت. ئەمەش ڕەنگ بێت بەهۆی کاردانەوەی نەخۆشیەکانی



گورچیلەلەسەریەرگری لەش بێت وتوانای لەش لەپارێزگاریکردنی لەباری تەندروستی لەش کەم دەبێت وبێ هێزدەبێت وفەرمانەکانی لەش بەتەواوی جێبەجێ ناکات ئەمەش دەبێتەهۆی ماندووکردنی دڵ. زۆرکات مرۆڤ گورچیلەکانی بەدووئەندامی بچووک دێتەبەرچاوکەفرمانیان دەرکردنی پاشماوەکانەلەڕێگای میزکردن بەڵام فرمانی گورچیلەکان لەمەزیاترە:گورچیلەکان ڕۆڵی گرنگیان هەیەلەڕێکخستنی کاری موولوولەخوێنەکان وڕێکبوون وجێگیربوونی فشاری خوێن ودروست بوونی خڕۆکەسۆرەکانی خوێن ودروست بوونی ڤیتامین (D) ودەستکەوتنی کالیسیۆم.

نەخۆشیەباوەکانی گورچیلەدەبێتەهۆی:کەم خوێنی،بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،نەخۆشی ئێسقانەکان،نەخۆشیەکانی دڵ وزووومردن. نەخۆشیەکانی گورچیلەچارەسەرکردنیان ئاسانەتەنانەت ئەوانەی تووشی پەککەوتنی گورچیلە بوونەدەتوانرێت بەشووشتنی گورچیلەیان گۆڕینی گورچیلەوچاندنی یەکێکی نوێ ژیانی تووشبووەکەرزگاربکرێت. بەڵام لەهەموو ئەوانە گرینگتر بریتیە لە پیادەکردنی هەنگاوەکانی خۆپاراستن،بەچەندرێنماییەکی سادەوبچووک گورچیلەکانت لەنەخۆش کەوتن دەپارێزیت.

***هۆکارەکانی مەترسی توشبوون بەنەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەزیاددەکەن؟**

١- هۆکاری دیمۆگرافی:

ا. بەناوساڵ کەوتن وپیربوون.

ب. ئەوخانەوادانەی کەنخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەیان تێدازۆرە.

ج. نەبوونی ونەخوێندەواری.

٢- هۆکاری سەرەکی:

ا. بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

ب. نەخۆشی شەکرە.

٣- نەخۆشیەکانی ڕێڕەوەکانی میز:

ا. ئەستووربوونی پرۆستات.

ب. بەردەکانی گورچیلەکان.

ج. هەوکردنەکانی کۆئەندامی میز.

ت. بوونی پەککەوتنی لەناکاوی گورچیلەلەکۆندا.

٤- نەخۆشیەکانی لەش:

ا. هەوکردن.

ب. شێرپەنجە.

ج. نەخۆشیەکانی بەرگری لەش.

٥- هۆکاریتر:

ا. نەخۆشیەکانی پدوو.

ب. هەندێک دەرمان وژەهر.

ج. زیادبوونی ئاستی ڕێژەی کۆلیسترۆل وچەوری لەناوخوێندا.

ت. قەڵەوی وبەتایبەتی ئەوانەی هوورگنن.

ه. جگەرەکێشان.

سەرچاوە:بەدەستکاریەوە،لەراپۆرتی زانکۆی کامبریدج،کانوونی یەکەمی ٢٠١٠ز.





# Awamedica
*Committed to Quality*




## Mebeverine Awa

Each film-coated tablet contains:
Mebeverine Hydrochloride BP 135 mg.
30 tablets.

Mebeverine Awa is an antispasmodic drug used for the treatment of irritable bowel syndrome (IBS), chronic irritable colon, spastic constipation, mucous colitis and spastic colitis.

Dosage and administration:
Swallow the tablets whole with water.
Adults and children over 10 years:
1 tablet 3 times/day, or as prescribed by your doctor.




## AwaLibrin

Each film-coated tablet contains:
Chlordiazepoxide BP 5 mg and Clidinium Bromide USP 2.5 mg.
30 tablets.

AwaLibrin helps to reduce anxiety and relieves stomach spasms and intestinal cramps. It is also used to treat ulcers and irritable bowel syndrome.

Dosage and administration:
Adults and children 12 years and older: 1-2 tablets, 3-4 times a day. Take your medicine ½-1 hour before meals and at bedtime. Or as prescribed by your doctor.

## Omeprazole Awa 20

Omeprazole Awa is used for the treatment of ulcers in the stomach and in the upper part of intestine, to relieve and prevent the repeat cases of heartburn, acid reflux disease and Zollinger-Ellison syndrome.

Dosage and administration:
Swallow your capsule whole with a glass of water, do not chew or crush them.
Adults: 1-2 capsules/day, or as prescribed by your doctor.




Each capsule contains:
Omeprazole enteric coated pellets equivalent to Omeprazole 20 mg.
14 capsules.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq

# نەخۆشی بە وێنە: بەردی گورچیلە



بەردی گورچیلە پێکدێت لە خوێ وکانزاکانی ناومیزکەبەیەکەوەدەنووسێت وەدەبنەتۆپەڵێک لەناومیز. کەخڕبوونەوەیان لەگورچیلەدەبن یان لەهەرشوێنێکی ڕێڕەوەکانی میز. قەبارەیان جیاوازەولەوانەیەهەندووردیلۆکەبن هەندەی ووردیلەکانی خۆریان هەندەی قلەنیسکەکی یان گەورەبن هەندەی تۆپۆکەکی گچکە. بەردی گورچیلەیەکێکە لەهۆکارەسەرەکیەکانی بوونی خوێن لەمیزداوژانەزگ یان ژان لەتەنکێشەکان وناوگەران. یەک لەهەربیست کەس بەدرێژایی ژیانی تووشی بەردی گورچیلەدەبن. پیاوان بەڕێژەی (١٢٪) وئافرەتان بەڕێژەی (٥٪)تووشی بەردی گورچیلەدەبن.

## هۆکارەکانی تووشبوون بەبەردی گورچیلە؟




بەردی گورچیلەئەوکاتانەدروست دەبێت کەناهاوسەنگی دەکەوێتەنێوان ڕێژەی ئاو،خوێ،توخم وکانزاکان لەناومیزدا. هەروەهامادەکانی وەک خوێ ی ترشی یوریک وترشی ئەمینی وسیستین کەدەتوانن بەرددروست بکەن. ووشک بوونەوەوکەم خواردنەوەی ئاووشلەمەنی،زۆرماندووبوون وئاونەخواردنەوەمەترسی تووشبوون بەبەرد زیاددەکات. بەردی گورچیلەلەوانەیەهۆکارەکەی نەخۆشیەکیتربێت یان هۆکاری بۆماوەیی بێت.

## کێن ئەوانەی مەترسی تووشبوونیان بەبەردی گورچیلەهەیە؟



لەوویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاهەندێک کەس بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانرێت لەوانیترزیاترتووشی بەردی گورچیلەدەبن. لەم دواییەداژمارەی ئەوانەی بەردی گورچیلەیان هەیەڕوولەزیادبوونەبەتایبەتی لەم سی ساڵەی دواییدا. لەساڵانی حەفتاکانداتەنیا (٣. ٨٪)هاووڵاتیان بەردی گورچیلەیان هەبوویەڵام ئەورێژەیەلەکۆتایی هەشتاکان وسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوویەرزبۆوەبۆ (٥. ٢٪). لەئەمەریکاسپی پێستەکان زیاترلەڕەش پێستەکان تووشی بەردی گورچیلەدەبن. بەزۆریش لەپیاوان دەبێت. دوای ئەوەی پیاوەکان بەناوچل ساڵی کەوتن ئەگەری بوونی بەردی گورچیلەیان دەبێت وهەتاحەفتاکانی تەمەنیان ئەوئەگەرەیان هەردەبێت. هەرچی ئافرەتانن ئەوالەپەنجاکانی تەمەنیان ئەوئەگەرەیان زۆردەبێت.

## نیشانەکانی بەردی گورچیلە



کاتێک بەرلەناوگورچیلەیەزۆربەی کات بێ نیشانەیەبەڵام کاتێک بەردەکەلەگورچیلەهەردەقەنێت وبەرەوبۆڕی میزدەڕوات ئەواژانێکی لەناکاووتوونددروست دەکات. نەخۆشەکەعەجمانی نیەوهاواردەکات وخۆهەڵگێڕووەرگێڕدەکات. ژانەکەی لەپشتێتی یان لەتەنکێشەکانی یان لەناوگەرانی یان لەزگی. خوێن لەمیزدادەبێت. وەئەگەرلەگەل بەردەکەهەوکردن ە ەبوونەخۆشەکەمیززوورانەوەوزۆرمیزکردن وتاولەرزی دەبێت.

## دیاریکردنی بەردی گورچیلە



بەردی گورچیلەزۆربەی جارئەوکاتانەدیاریدەکرێت کەژان دروست دەکات. ژانێکی لەناکاووتووندوادەکات کەسەکەهەریچێت بۆیەکەی فریاکەوتن. پشکنینی پێویست دەکات لەوانەپشکنینی میزوتیشکی ئێکس وسۆناروهەندێکجارپشکنینی خوێن بۆزانینی ڕێژەی خوێیەکان لەناوخوێندا.

## چارەسەرکردنی بەردی گورچیلە



ئەگەردوای پشکنین دەرچووبەردت هەیە. بەردەکەت بچووکەپزیشکی چارەسەرکەردەرمانی ژان لابەرت بۆدەنووسێت،ئامۆژگاریت دەکات کەبڕی زۆرلەئاووشلەمەنی بخۆیتەوەبۆئەوەی زۆرمیزبکەیت چونکەلەوانەیەبەردەکەلەخۆوەفڕێ بدەیت. ڕۆژانەهەشت تادەبەرداخ ئاوبخۆوە. هەرچەندبەردی گورچیلەبچووک بێت ئەوانەگەری فڕێدانی زۆردەبێت. ئەگەربەردەکەلە (٥mm واتە (٥/١ inchبچووکترئەوا٩٠٪لەوانەیەبەردەکەفڕێ بدەیت. بەڵام ئەگەرلەنێوان (٥ - ١٠mm)بووئەوا٥٠٪لەوانەیەفڕێ بدەیت.

## دەرمان



چەنددەرمانێک هەن کەیارمەتی فرێدانی بەردلەگورچیلەدەدەن. ئەودەرمانانەدەبنەهۆی خاوبوونەوەی دیواری بۆڕی میزوفراوان بوونی ولەئەنجامداڕۆیشتنی بەردەکەوفڕێدانی. کاردانەوەی لاوەکی زۆرکەمە (سەرئێشان وگێژبوون). دەرمانیتریش هەن بەکاردێت بۆخۆپاراستن بۆدروست نەبوونی بەرد.

## شکانی بەردبەتیشک



یەکێکەلەکردارەباوەکانی شکاندنی بەردلەگورچیلە (ESWL) کەبەبەکارهێنانی شەپۆلی تیشک بەردی گورچیلەپارچەپارچەدەکرێت بۆپارچەی بچووکترودواترئاسان فرێدانی بۆ دەرەوە. کاردانەوەی لاوەکی بریتیەلەخوێن میزتن وژان.

پێ بینی بۆڕی میز (Ureteroscopy)

کاتێک بەردلەگورچیلەدەرهات ولەمیزڵدان نزیک کەوت ئەوکات پێ بینی بۆڕی میزبەکادێت.بۆڕیەکی گچکۆلەبەڕێگای میزەڕۆبۆشوێنی بەردەکەدەبردرێت،قەپی لە بەردەکەدەدات وبەردەکەدەردەهێنرێت.ئەگەربەردی گورچیلەزۆرگەورەبووپێویست بەنەشتەرگەری دەکات بۆدەرهێنانی.

## خۆپاراستن



هەرکاتێک بەردی گورچیلەدەرهات پزیشک بەردەکەبۆپشکنین دەنێرێت،تابزانێت بەردەکەلەچی پێکهاتووە. نزیکەی٨٠٪بەردەکانی گورچیلەلەکالیسیۆم پێکدێت،ئەوانیتر لەیوریک ئەسیدوستروڤاین وسیستین. هەرکەپێکهاتەی بەردەکەزانرا خۆپاراستن ئاسان دەکەوێت.

# Awamedica

*Committed to Quality*




## Meloxicam Awa 7.5

Each tablet contains:
Meloxicam BP 7.5 mg.
20 tablets.

Meloxicam Awa 7.5 is an NSAID used to reduce painn, stiffness and inflammation. It relieves the symptoms of rheumatoid arthritis, ankylosing spondylitis and acute episodes of osteoarthritis.

Dosage and administration:

Adults and children 12 years and older: 1-2 tablet/day with food, or as prescribed by your doctor.




## Meloxicam Awa 15

Each tablet contains:
Meloxicam BP 15 mg.
20 tablets.

Meloxicam Awa 15 is an NSAID used to reduce painn, stiffness and inflammation. It relieves the symptoms of rheumatoid arthritis, ankylosing spondylitis and acute episodes of osteoarthritis.

Dosage and administration:

Adults and children 12 years and older: ½-1 tablet/day with food, or as prescribed by your doctor.




## Mefenamic Awa

Each capsule contains:
Mefenamic acid BP 250 mg.
20 capsules.

Mefenamic Awa is a non-steroidal anti-inflammatory drug (NSAID) with analgesic effect. It is used to treat arthritis, headache, tootache, muscle pain, menstrual pain and to reduce excessive menstrual bleeding.

Dosage and administration:

Swallow your capsules whole with a glass of water, with or after a meal.

Adults: 2 capsules, 3 times a day, or as prescribed by your doctor.




## Diclofenac-SR 100

Each film-coated sustained release tablet contains:
Diclofenac Sodium BP 100 mg.
20 tablets.

Diclofenac-SR Awa is an non-steroidal anti-inflammatory drug (NSAID) used to treat pain, reduce swelling adn ease inflammation.

Dosage and administration:

Swallow the tablets whole with a glass of water, do not crush or chew.

Adults: 1 tablet/day, or as prescribed by your doctor.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq

# هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میزلەمنداڵان

## Urinary Tract Infection



به سەرپەرشتی د. زاهیر تاهیر گەردی
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی منداڵان
بۆرد (دکتۆرا) لە نەخۆشییەکانی منداڵان

هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میزیەیەکێک لەباووترین نەخۆشیەکانی منداڵان دادەنرێت. منداڵان لەساڵی یەکەمی تەمەنیان کوڕان زیاترلەکچان تووشی ئەونەخۆشیەدەبن،بەڵام دواترلەتەمەنی پێنج ساڵی گۆڕانکاری بەسەرڕێژەی تووشبوون دادێت ودەبێت بەرێژەی١٨٪لەکچان وڕێژەی٩-٢٪لەکوڕان. ئەمەش بۆکورتی دەرچەی میزەڕۆلەکچان بەبەراووردلەگەل کوڕان دەگەڕێتەوەونزیکی دەرچەی میزەڕۆلەکۆم ولەئەنجامدائاسانکاری بۆگواستنەوەی بەکتریابۆدەرچەی میزودواتربۆمیزڵدان وتووشبوون بەهەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میز. دەبێت ئەونەخۆشیەلەمنداڵان زۆرگرنگی پێ بدرێت وچارەسەری تەواوی بۆبکرێت بەتایبەتی لەومنداڵانەی کەتەمەنیان لەشەش ساڵ کەمترەچونکەئەگەر وانەبێت،لەوانەیەماکی ترسناک لەسەرگورچیلەی منداڵەکەدروست بکات.

*جۆرەکانی هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میز:

١ - هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی سەرەوە (هەوکردنی گورچیلەکان، (Upper U. T.I ئەمەزۆرکەم لەمنداڵان دەبینرێت،بەڵام ئەگەردروست بووترسناکی زۆرە.

٢- هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی خوارەوە (هەوکردنەکانی میزدۆومیزەڕۆ):ئەمەزۆرتربڵاوە.

*هۆکارەکانی یارمەتی تووشبوون بەهەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میزدەدەن:

١ - میزتێزان لەمیزڵدان بەهۆی ڕاگرتنی میز. چ بەهۆی:نەخۆشیەکی زگماکی بێت یان نارێکی لەمیزکردن بێت وکاتێک منداڵەکەمیزی دێت میزناکات وڕایدەگرێت یان بەهۆی نارەوانی (الامساک)بێت کەدەبێتەهۆی فشارخستنەسەرمیزدۆبەهۆی ڕیخۆڵەئەستووره (قۆلۆن) ولەئەنجامدامیزتێزان وقەتیس بوونی میزلەمیزدۆ.

٢ - زۆربەکارهێنانی دژەزیندەگیەکان ([redacted] الحیویة واسعة).

منداڵ بەسرپینەوەی کۆمی بۆگەروگوونی،واتەلە پشتەوەبۆپێشەوە کەدەبێتەهۆی گواستنەوەی بە کتریا لە پشتە وە (لە کۆ مە وە) بۆ کو و نی میزومیزەڕۆ.

***نیشانەکان:**

ا-هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی سەرەوەی میز:

١. زگ وتەنکێش ئێشان وژان کردن.

٢. بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش وتالێهاتن.

٣. ڕشانەوەوبوورانەوە.

٤. ناوەناوەتووشبوون بەناڕەوانی.

زۆرجارهەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی میزلەمنداڵان دیاری ناکرێت. ڕێژەی دیاریکردنی نزیکەی٢٠٪یەئەمەش بەهۆی نادیاری نیشانەک انیەتی،کەلەوانەیە:نەبوونی ئارەزووی خۆراک ودابەزینی کێشی لەش وڕاڕایی وهاروهاجی یان زووتووڕەبوون بێت.

ب- هەوکردنەکانی ڕێڕەوەکانی خوارەوەی میز:

١.میزسۆتانەوە و میززوورانەوە (لە گەل میزکردن دەگرییێت یان هاوری ناوگەرانی خۆی دەکاتن).

٢. میزبەخۆداکردن وبرمیزی لەڕۆژدا.

٣. شەومیزلەبنەخۆی دەکاتن.

٤. زۆرچوون بۆمیزکردن.

٥. بنی زگی دەیەشێت.

٦. بۆگەنی بوون وگۆڕانی بۆنی میزەکەی.

٧. تالێهاتن وبەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش بەبێ هۆیەکی دیار.

دەبێت ڕەچاوی هەموونەمازانستیەکانی دیاریکردنی ئەم نەخۆشیەبکرێت لەمنداڵان. هەموهەنگاوەکان یەک بەیەک بکرێت:ئەویش بەپشکنینی میزوچاندنی میز(مزرعەالبول) بۆزانینی هۆکاری هەوکردنەکەی ودیتنەوەی بەکتریای هۆی هەوکردنەکەوپێدانی چارەسەری تایبەت بەوبەکتریایە.

میزلەمنداڵی مەلۆتکەلەڕێگای کیسێکی پلاستیکی



٣-لەبەرکردنی دەرپێقووتەی تەسک وتریسک.

٤-جوان خاوێن نەکردنەوەی منداڵ:بۆنموونەگۆڕینی حەفازەی منداڵ وخاوێن کردنەوەی قوونی



خاوێن کەلەزۆربەی تاقیگەکان هەیەخڕدەکرێتەوە. هەرچی منداڵی بەتەمەنترن ئەواقۆدی خاوێن هەیەبەکاردێت.

دەبێت منداڵەکەدایکی لەگەل دابێت ویەکەم قە ترەمیزبخرێتەناوقۆدیەک،دواترمیزەکەی بڕوات وناوەندی میزەکەی بخرێتەناوقۆدیەکەیتروبنێرێت بۆتاقیگە.

*چارەسەر:

١-پزیشکی پسپۆڕدەبێت چارەسەری پێویست بدات بەمنداڵەکەت ولەخۆڕاولەتۆڕینگەکانی ناوکۆلانان دەرمان وەرمەگرە. پزیشک بەگوێرەی دەرئەنجامی پشکنینی میزەکەوچاندنی میزەکە (مزرعەالبول)دەرمانی بۆدەنووسێت. دەبێت تەواوگوێرایەلی چەندێتی وچۆنیەتی پێدانی دەرمانەکەبیت کەپزیشک بۆی دیاریکردووی. نەکەی لەخۆوەدەرمانەکەڕابگریت. ماوەکەی



تەواودەرمانەکەبدەبەمنداڵەکە.

٢. دوای تەواوبوونی دەرمانەکە:سەردانی پزیشکی تایبەتمەندبکەوەبۆدڵنیابوون لەچارەسەرکردنی تەواوی منداڵەکەت.

٣. ئاووشلەمەنی زۆربدەبەمنداڵەکەت.

*خۆپاراستن:

١-دەرپێقووتەوبێجامەی منداڵەکەت تەسک وتریسک نەبێت.

٢-فێری گۆڕینی حەفازەبەڕێگای تەندروستی بە،ئەگەرنەت دەزانی بپرسە.

٣-زۆرلەگەرماوکەفی بۆشووشتنی منداڵەکەت بەکارمەهێنە.

٤-ئەگەرمنداڵەکەت زۆرناڕەوانی (الامساک)ی هەبوو،درێغی مەکەلەچارەسەرکردنی.

٥-دایکان:منداڵەکانتان فێربکەن کەچۆن بەڕێگایەکی زانستیانەوخاوێن،چۆن دوای میزکردن وپیسایی کردن خۆخاوێن بکەنەوە.

٦-ئامۆژگاری منداڵەکانتان بکەن کەلەخۆڕامیزڕانەگرن.



# کاسیتەری شوشتنی گورچیلەی کاتی



د. دلشاد عەبدوولڕەحمان
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی گورچیلەو شۆردنی گورچیلە
یەکەی گورچیلەی دەستکرد
نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری/هەولێر

**لەبەرزۆری ئەونەخۆشانەی کەپێویستیان بەشووشتنی گورچیلەی خێراهەیەلەبەردرەنگ گەیشتنیان بۆیەکەی گورچیلەودیتنی لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی گورچیلەجاچ نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن یان نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی کاتی بێت بەکارهێنانی کاسیتەری شووشتنی گورچیلەی کاتی (هیمۆدایلایزەر کاسیتەر)زۆرگرنگەبۆدەستەبەرکردنی ڕێڕەوی شووشتنی گورچیلەلەڕێگەی خوێن لەونەخۆشانەی کەهیچ ڕێڕەوێکی خوێنیتریان نیەبۆهیمۆدایلایزەر،بەڵام بەکارهێنانی ئەم کاسیتەرەهەندێ گرفتی هەیەوەک تووشبوون بەهەوکردن یان هەندێ گرفتی میکانیکی وەک گیرانی کاسیتەر.**

**هۆکارەکانی پێویستی کاسیتەرەکەوەک ڕێڕەوێکی کاتی بۆهیمۆدایلایزەر:**

١- نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن.
٢- نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی کاتی.
٣- ئەو نەخۆشانەی پێویستیان بەگۆڕینی پلازمای خوێن هەیە (plasmapheresis).

**شوێنی دانانی کاسیتەری کاتی هیمۆدایلایزەر:**

١-خوێنهێنەری مل (Internal jugular vein).
٢-خوێنهێنەری ژێرچەلەمە (Subclavian vein).
٣- خوێنهێنەری ڕان (Femoral vein).
٤-کەلەکەخوێنهێنەری خواروو (Inferior vena cava) کەلەهەندێک سەنتەری پێشکەوتوودادەنرێ.

**گرنگترین گرفتەکانی کاسیتەری کاتی هیمۆدایلایزەر:**
ئەم گرفتانە دەکرێن بەدووبەش:

**بەشی یەکەم/ گرفتی دانانی کاسیتەرەکەکەبریتیەلە:**

١- خوێن بەربوون (bleeding).
٢-بریندار کردنی خوێنبەرەکان (arterial injury).
٣-خوێن تێزانی ژێر پێست (هیماتۆما «hematoma»).
٤- نەدۆزینەوەی ڕێرەوەی خوێنهێنەر (failure to get vascular access).

**بەشی دووەم/ گرفتەکانی مانەوەی کاسیتەرەکەلەناو خوێنهێنەرەکە،کەبریتیەلە:**

١- تووشبوونی خوێن بەبەکتریالە ڕێگەی کاسیتەرەکە (catheter related sepsis).
٢- تووشبوونی شوێنی دەرەوەی کاسیتەر (catheter ex. site infection).



(Double Lumen Catheter Kit)
وێنەی پێکهاتەی کاسیتەری دووبۆڕی

٣- خوێن مەیینی ناوکاسیتەرەکە (catheter thrombosis).

٤- نووشتانەوەی کاسیتەر (گیرانی میکانیکی) (catheter kicking «mechanical obstruction»).

**هۆکارەکانی دەرهێنانی کاسیتەرلەونەخۆشانەی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەنیان هەیە:**

١- نەمانی پێویستی بەم کاسیتەرەلەبەرپێگەیشتنی بەستنەوەی خوێنبەربەخۆێنهێنەرەوە (maturation of arteriovenous fistula).

٢- تووشبوونی خوێن لەڕێگەی کاسیتەر.

٣-تووشبوونی بەکتریایی لەشوێنی دەرەوەی کاسیتەرەکە.

٤- بەهۆی خوێن مەیینی ناوکاسیتەرەکە،کەبووتەهۆی گیرانی.

٥-کاسیتەرەکە دەرهات لەبەرنووشتانەوەی کاسیتەرەکە (گیرانی میکانیکی).

وە ئەم نەخۆشانەی پەککەوتنی گورچیلەی کاتییان هەیەیان چادەبنەوەوپێویستیان بەم کاسیتەرەنامێنێ وەیان بەرەوپەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن دەچن.

لەبەرزۆری تووشبوونی خوێنی بەبەکتریالەڕێگەی کاسیتەرەکەلەگەڵ تووشبوونی شوێنی دەرەوەی کاسیتەرەکە چاندنی سەری کاسیتەرەکەلەگەڵا سوابی وەرگیراولەشوێنی دەرەوەی کاسیتەرەکەبەکاردەهێنن.بۆ زانینی جۆری بەکتریای تووشبووکەلەزۆربەی توێژینەوەکان ستافیلۆکۆکەس ئۆریەس (Staphylococcus auras) لەگەڵا (Staphylococcus. epidermidis) ستافیلوکۆکەس ئیپدیرمیدیس واتابەکتریای گرام پۆزەتیڤەکانەکەزۆربەی هۆکاری تووشبووەکانن نزیکەی لە (٧٨٪)کەلەڕێگەی پێستەوەدەگوازرێنەوە (ئەم جۆرەبەکتریانەوەک هاوژیان لەسەر پێستەوەن (skin commensally)،وەبەکتریای گرام نێگەتیڤەنزیکەی لە (١٢٪)تووشبووەکان،وە ئەوانیتر بەکتریای جۆراوجۆروتێکەڵن.





# هەڵوێستی ئایین وپزیشکی

د. اقدام کەمال شاکر
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی گورچیلە
پزیشکی ڕاوێشکاری نەخۆشییەکانی گورچیلە
یەکەی گورچیلەی دەستکرد
نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری/هەولێر

## هەلوێستی ئایین و پزیشکی
## دەربارەی چاندن وگواستنەوەی ئەندامەکان

موقف الشرع و الدين من نقل وغرس الاعضاء

ئایینی پیرۆزی ئیسلام کەتاکەئایینێکی پیرۆزەبۆسەرجەم گـرۆی ئـادەمـی هاتووە،ڕێبازێکی تـەواوی ژیانی تێدادیاریکراوە.لەبەرئەوەی وولاتـی ئێمەوولاتێکی موسڵمانەولەزۆربەی وولاتەئیسلامیەکان،یاسادانان چاووگی سەرەکی بریتیەلەبنەماکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی.بۆیەتاووتوێکردنی هەرمەسەلەیەککەپەیوەندی بەکۆمەڵگاهەبێت پێویستەهەڵوێستی ئایینی دەربارەیەوەبزانرێت بەتایبەتی گواستنەوەوچاندنی ئەندامەکانی لەش.

**ڕێبازی ئیسلام لەپەیوەندی مرۆڤ بەجەستەیەوە:**

١.ژیـانـی ئـادەمـیـزادزۆرپـیـرۆزە.بـەڕادەیـەک پیرۆزەکەهەموومرۆڤایەتی لەناوبچێت نەوەک کەسێکی بێتاوان بکوژرێت.ڕزگارکردنی ژیانی کەسێک وەک ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤایەتییە.

٢.هەموومرۆڤەکان یەکسانن لەوەی کەمافی ژیانیان هەیەلەهەرئاست ویلەوچین وتوێژێکی کۆمەڵایەتی وزانستی وئابووری دابن.

٣.ئەوەی ژیان بەمرۆڤدەبەخشێت،خوای گەورەیەوهیچ کەسێک ئەومافەی نیەکەژیان لەیەکێکیتربسەنێت.

٤.خـوای گەورەپلەی ئادەمی بەرزڕاگرتووە،بەوەی کەبیرکردنەوەوشێوەیەکی جوانی پێبەخشیوە،هەروەک لەوئایەتەداهاتووە: (ولقدکرمنابنی آدم)





***هۆکارەکانی بەخشینی ئەندامێک لەڕوانگەی ئیسلامەوە:**

١.لەکاتی پێویستی زۆرفەرمان هەڵگیراوەوئاسان کراوە،بۆسوودی ئادەمیزاد.

٢.لەکاتی پێویستی زۆرکارپێویستەبکرێت ولەڕووی ئایینیەوەبەسوودەوبەخێربۆمرۆڤ دەنووسرێت،کە لەکاتیترناکرێت.

٣.زیانێکی کوژەری نییە.

٤.لابردنی نارێکی وپشێوی برای هاووڵاتیە. لەئەنجامدابڵاوکردنەوەی خێروخۆشیە.

٥.لەدووزیان کەمترینیان هەڵدەبژێرین.

*لەبەرهەموئەوهۆکارانەدەبینین ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێگای بەگواستنەوەی ئەندامەکانی لەش لەمرۆڤێکی زیندوویان مردووبۆمرۆڤێکیترکەسوودی لێوەربگرێت داوە،باشترین بەڵگەش ئەوفەرموودەیەی خۆشەویستە (د.خ):نموونەی بڕواداران لەخۆشەویستی وبەزەییان ودڵفراوانیان لەگەڵ یەکتری وەک جەستەیەک وان،هەرکاتێک ئەندامێکی جەستەکەنەخۆش کەوت هەموئەندامەکانیترتایان دێتێ وناخەون. هەروەهائەوفەرموودەیەش:بڕواداران وەکوبینایەکی بتەووان هەریەکەوئەویترتەواودەکات.

***هەڵوێست وڕای ئایینی ئیسلام دەربارەی چاندن وگواستنەوەی ئەندامەکانی لەش:**

مەسەلەی چاندن وبەخشینی ئەندام لەلایەنی ئایینی ڕێگای پێدراوەولەنیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووکاری پێدەکرێت،لەوانە:

١-فەتوای (شێخ حسن مامون)کەموفتی وڵاتی میسربووە،ژمارە (١٠٦٥)لەساڵی١٩٥٩زکەڕەزامەندیداله سەرگواستنەوەی خوێن لەیەکێکەوەبۆیەکێکیترکەژیانی ئەویتر پێ ڕزگاربکرێت ولەنەخۆشیەکەی چاک ببێتەوە.

٢.فەتوای (شێخ حسن مامون)ژمارە (١٠٨٧)لەساڵی ١٩٥٩زکەڕێگادرابەگواستنەوەی چاوی کەسێکی مردووبۆیەکێکی ساغ بۆبەکارهێنانی بۆچاکبوونەوەی چاوی کەسەساغەکە (ترقيع القرنية).

٣.فەتوای (شێخ احمدهەریری)موفتی وڵاتی میسر (ژمارە٩٩٢) لە ساڵی ١٩٩٦زکە ڕێگایدابەگواستنەوەی (قرنية)چاوی کەسێکی مردووچاندنی لەچاوی کەسێکی کوێربەمەرجێک لەسوودی کۆرەکەی بێت.

٤.فەتوای (شێخ جادالحق علی جهاد)موفتی وڵاتی میسر (ژمارە ١٣٢٣)لەساڵی ١٩٧٩زکەڕێگایدابەگواستن هوەی ئەندامێک یان بەشێک لەلەش لەکەسێکی ساغ

بۆکەسێکی نەخۆش کاتێک پزیشک زانی سوودی جەستەیی هەیەوژیان دەپارێزێت . هەروەهارێگایدابەبرینی ئەندامێک یان بەشێکی لەشی کەسێکی مردوووبەکارهێنانی بۆکەسێکی ساغ دوای ڕازیبوونی لەکاتی لەژیان دابوویان ڕازیبوونی کەس وکاری یان دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی دادگائەگەرکەس وکاری دیارنەبوو.

٥ .بڕیاری دەستەی گەورەزانایانی شانشینی سعوودی لەساڵی (١٩٨٢ز)کەدەڵێت:

أ-دەتوانرێت ئەندامێک یان بەشێکی لەکەسێکی مردووبۆکەسێکی زیندووبگوازرێتەوەلەبەرپێویستی . ئومێدی چاکبوونەوەبدات.

ب-دەتوانێت کەسێکی زیندووئەندامێکی لەشی یان بەشێکی ئەوئەندامەببەخشێت بۆپڕکردنەوەی پێویستی کەسێکیتربەمەرجێک زیانی پێ نەگەیەنێت.

٦ .فـەتـوای (پـێـشـەوا **محمد سید طنطاوی** ) لەساڵی١٩٨٢زکەموفتی وولاتی میسربووکەدەڵێت:

أ-مـرۆڤ نابیت هیچی جەستەی (بەخوێنیشیەوە) بفرۆشێت،نابێت وکارێکی یاساغەلەرووی ئاینیەوە .

ب .بەخشینی بەشێکی لەش بەخۆڕایی ئاساییەبەمەرجێک بەسوودی هەردوولابێت.

ج-چاندنی بەشێکی لەشی کەسێکی مردوولەڕووی ئاینەوەرێگادراوە .

٧ .فەتوای (شیخ یوسف القرضاوی )لەکیتابەکەی ڕۆشنایی ئیسلام لـەسـاڵـی١٩٩٤ز،لاپـەڕە (٥٣٢)،کە ڕێگادەدرێت کەسێکی ساغ گورچیلەی ببەخشێت بۆچاکبوونـەوەی کەسێکی نـەخـۆش وبەوکارەی سوودوچاکەی بۆدەبێت.

٨-بـانـگـەوازخـوازی ئیسلامی (د.عبداللە شحاتە) لەکیتابەکەی ڕەزامـەنـدی داوەلەسەرگواستنەوەی گورچیلەلەکەسێکی مردووبۆیەکێکی ساغ دوای وەرکرتنی ڕەزامەندی کەسەکە کەلەکاتی لەژیاندامابوو،هەروەها:

ا .قەدەغەکردنی کڕین وفرۆشتن بەئەندامەکانی لەشی مرۆڤ .

ب .هـاووڵاتـیـان هـان بدرێن بۆبەخشین بەخۆڕایی بۆوەدەست هێنانی خێروچاکە .

ج .نەهێشتنی گواستنەوەی ئەندامەکانی زاوزێ بۆتێکەڵ نەبوونی نەوەکان.

٩-نوێترین ودواترین ڕەزامەندی لەسەرڕێپێدانی بەخشینی ئەندامەکانی لەش بریتیەلەفەتوای شێخی ئەزهەر (ئیمام **محمد سید طنطاوی**)کەڕوونی کردەوەڕێگادەدرێت بەبەخشینی ئەندامەکانی لەش لەکەسی زیندوویان مردووبۆڕزگارکردنی ژیانی کەسێکیتر.

***هەڵوێستی پزیشکی دەربارەی بەخشینی ئەندامەکانی لەش:**

بەهۆی ئەوسەرکەوتنەگەورانەی لەبواری پزیشکی بەتایبەتی لەگواستنەوەوچاندنی ئەندامەکانی لەش بەدیهات .وەک گواستنەوەوچاندنی دڵ،گورچیلە،جەرگ،پەنکریاس،ڕیخۆڵە،پێست،ئێسقانەکان و....هتد. ئەمانەهەمووهاندەربوون لەبرەودان بەگواستنەوەوچاندنی ئەندامەکان بەمەرجێک بەگوێرەی یاساکانی نێودەوڵەتی ورەوشتی پزیشکی بێت.

لەهەموونەوانەی باسکران دەبینین:کەزانستی پزیشکی وئایین کۆکن لەسەربرەودان بەگواستنەوەوچاندنی ئەندامەکانی لەش لەکەسێکی زیندوویان تازەمردوو بۆیـەکـێـکـی سـاغ بـەمـەرجـێـک لەژێرڕۆشنایی ولەسەربنەمائەخلاقی وپزیشکی وئایینی وکۆمەڵایەتی بێت.



# یاساو ڕێپێدانی چاندنی کورچیله




مافپەروەر
لقمان فاروق نانەکەلی
ماستەر لە یاسا
ج.ب.گشتی تەندروستی هەولێر

**ماددەی٦٩ لە پەیمانی ئیسلامی جیهانی بۆ کارو ڕەوشتی پزیشکی دەڵێ:**

نابێ لاشەی مرۆڤ بازرگانی و کرین و فرۆشتنی پێ بکرێ بۆیە بازرگانی کردن بەلاشەو جەستەو ئەندامی مرۆڤ قەدەغەکراوە. وەهەروەها قەدەغەی راگەیاندنیشی کردووە لەسەر کرین و فرۆشتنی هەر ئەندامێکی لەش مرۆڤ بەرامبەر بە پارە.وەنابێ پزیشک بە شداری بکات لەم جۆرە معامەلا تانەکە کرین و فرۆشتنی تێدابێ لەگەڵ پێش کەوتنی زانستی پزیشکی دا بیر لە دەکرایەوە لە زۆر وولاتان بە دانانی یاسایەک لە بابەتی چاندنی گورچیلە بە تایبەتی م ١،٢،٣ لە یاسای ژمارە ٨٥ سالی ١٩٨٦ عیراقی بۆ چاندنی گورچیلە:

**ماددەی ١:**
دەلێ دەتوانێ نەشتەرگەری چاندنی گورچیلە بکرێ بۆ نەخۆش بە ئامانجی چارەسەرکردن بۆ ئەوەی ژیانی بپارێزرێ، بە تایبەت لە لایەن پزیشکی تایبەتی لە نەخۆشخانەیەکی تایبەت بەم بوارە.

**ماددەی ٢:**
دەتوانرێ رەزامەندی بەخشینی ئەندامی جەستە بۆ چاندن وەربگیرێ لە بەخشەر:
أ-بەخشەر بیر و هۆشی تەواو بێ و ١٨ ساڵی تەواو کردبێ و بە نوسین رەزامەندی خۆی بنوسێت و ئەندامی خۆی ببەخشێت.

ب-ئەو نەخۆشەی دەماغی لە کارکەوتبێ بە پێی زانستی پزیشکی نوێ، یەکێک لە خزمە نزیکەکانی بالغ و عاقل بێ و تەمەنی ١٨ سال بێ و پلەی یەک یاخود دووی بەخشەر بێ و وە رەزامەندی لێژنەی تایبەت لە ٣ پزیشک پێک هاتبێ وە پزیشکی تایبەتی نەخۆشی کەللەسەرو دەماری لەگەڵ بێ و پزیشکی چارەسەری لەگەڵ بێ بەڵام نابێ پزیشکی نەشتەرگەری لەگەڵ بێ کە چاندنەکە دەکات.

**ماددەی ٣ :**
کرین و فرۆشتنی ئەندامی جەستەی مرۆڤ قەدەغە دەکات بە هەموو شێوەیەک تەنها دەبێ مەبەست بەخشین بێ و مەبەستی مادی نەبێ و پارە وەرنەگیرێ . وە پزیشکی نەشتەرگەر دەبێ ئەم چاندنە نەکات ئەگەر زانی بە مەبەستی مادی یە .

**ماددەی٤ :**
سزای ١ سال زیاتر نەبێ و پێبژاردن لە ١٠٠٠ دینار زیاتر نەبێ دانراوە یەک لەم سزایانە بۆ ئەو کەسەی سەرپێچی ئەم یاسایە بکات .

# نەخۆشیەکانی گورچیلە

نەخۆشیەکانی گورچیلەدوژمنێکی سەرسەخت وبێدەنگی مرۆڤە.خۆمات دەکات،تالەناکاودەستی خۆی دەوەشێنێت.

ڕێـژەی نەخۆشیەکانی گورچیلەلەسەرانسەری جیهاندا ڕوولـەزیـادبـوونـەلـەبـەرئـەوەی هـۆکـارەکـانـی کەتووشی نەخۆشیەکانی گورچیلەمان دەکـات ڕوولـەزیـادبـوونـە. هەرکاتێک نەخۆشیەکانی گورچیلەزیادی کردئەواتێچوونی چارەسەروبەدواداچوونی نەخۆشیەکەزۆردەبێت.بەمەش بڕی زۆرلەدارایی وکات وتەندروستی مرۆڤ بەفیڕۆدەڕوات. لەووڵاتێکی وەک:وویـلایـەتـەیـەکـگـرتـووەکـانـی ئەمریکا نزیکەی نیوملیۆن نەخۆش چارەسەریان بۆپەککەوتنی گورچیلە لە ساڵی ۲۰۰۰ز بۆدەکراوئەوڕێژەیەلەساڵی۲۰۱۰ زنزیکەی٤٠٪زیادیکرد.پسپۆڕانی بواری ئابووری مەزەندە دەکەن تەنیالەوویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکالەدەساڵی داهـاتـووتـێـچـوون وخـەرجـیـەکـانـی نەخۆشیەکانی گورچیلەنزیکەی یـەک تریلیۆن دۆلاری ئەمریکی بێت. بـەمـەش کـەرتـی تەندروستی ئـەووڵاتـەبـارێـکـی گرانی دەکەوێتەسەرکەئەگەربەووڵاتانی ڕۆژهـەڵاتـی ناوەڕاست بـەراووردبـکـرێـت،کـەبـاری دارایـــی وئـابـووری وڕامیاری جێگیرنیە،ئەوبڕە پارەیەبۆدارایی ئەووڵاتانەزۆردەگەیەنێت. لـەزۆربـەی ئـەووڵاتـانـەئـەوانـەی کـەتـووشـی نەخۆشی گـورچـیـلـەدەبـن تـەمـەنـیـان لـەخـوارچـل سـاڵـیـەوەیـە.

نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەئەگەرهاتووزوودەست نیشان کرائەوادەتوانرێت چارەسەربکرێت ودووربێت لەدەرکەوتنی ئالۆزیەکانی بەتایبەتی پێش ئـەوەی بگات بەوقۆناغەی شووشتنی گورچیلە یان گۆڕینی گورچیلەی بۆ بکرێت، چونکەنەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەئەگەرلەقۆناغەکانی دوایـی دەرکـەوت ئەواهیچ چارەسەرێکی نیەتەنیاگۆڕینی گورچیلەنەبێت کـەئـەمـەش پێویستی بەداهاتێکی زۆروبوونی کەس هەیەکەگورچیلەببەخشن.هەروەهائەوەش لەبەرچاوبگیرێت: نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەیارمەتی سەرهەڵدانی نەخۆشی درێژخایەنیتری وەک نەخۆشیەکانی دڵ دەدات.ئەمەش باری سەرشانی نەخۆشەکەگرانتردەکات.

نەخۆشیەکانی گورچیلەکان لـەسـەرەتـادا بێنیشانەن. لەبەرگرنگی گورچیلەکان پێویست دەکـات مرۆڤ گرنگی بەتەندروستی گورچیلەکان بدات.هەندێک کەس هەیەدەبێت زیاترئاگاداری تەندروستی گورچیلەکانیان بین،لەوانە:ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە،ئەوانەی نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێنیان هەیە،تاکەکانی ئەوخانەوادانەی کەنەخۆشی درێژخایەنی گورچیلەیان هەیە،ئەوانەی قەڵەون،ئەوانەی تەمەنیان لەسەرووی پەنجاساڵیەوەیە،جگەرەکێشەکان.

**هەرچی ئەوانەن کەهیچ نەخۆشیەکیان نیە،دەبێت گرنگی بەدروستی گورچیلەی خۆیان بدەن بەمەش چەندئامۆژگاریەک هەیە،پیادەی بکەن:**

١-وەرزش بـکـە:وەرزش کـردن دەرمـانـێـکـی تــەواوی نەخۆشیەسەردەمیەکانە.هۆکارێکەبۆهەردەم گەنج بوون ودووربـوون لەنەخۆشیەکان.ئەگەرهەرنەبێت لەحەفتەی پێنج ڕۆژهـــەرڕۆژی نیوکاتژمێردەبێت وەرزش بکەیت ئەگەرنەکرابەپێ ڕێ بکەیت.مامۆستایانی ئایینی هەماهەنگی پزیشکان بکەن بەڕوونکردنەوەی ئەوەی:کەخۆشەویست (د.خ) هەموورۆژبەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزان دوای نوێژی عەسریەپێ ڕێی کردووە.ئەمەبۆخەلک ڕوون بکرێتەوەوبرەوی پێبدرێت.

٢-چـاودێـری ڕێـژەی شەکرلەناوخوێن بکەیت:نزیکەی نـیـوەی ئـەوانـەی نـەخۆشـی شـەکـرەیـان هەیەتووشی نـەخـۆشـیـەدرێـژخـایـەنـەکـانـی گـورچـیـلـەدەبـن. هەرلەبەرئەوەزوودەست نیشان کردن وچارەسەرکردنی تەواوی ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیەهۆکاردەبێت لەدووربوون لەنەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلە.

٣-ئاگاداری فشاری خوێنی خۆت بە؟زۆرلەوانەی نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێنیان هەیە،لەوەدەترسێن نەوەک تووشی نەخۆشی دڵ یان نۆرەی مێشک ببن.ژمارەیەکی کەمیان ئـەوەدەزانـن کـەبـەرزبـوونـەوەی فـشـاری خوێن هۆی سەرەکی تێکدانی کـاری گورچیلەکان وتووشبوون بەنەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەیەبەتایبەت لەوانەی لەگەل بـەرزبـوونـەوەی فشاری خوێن نەخۆشیتری وەک نەخۆشی شەکرەوڕێژەی چەوری (کۆلیسترۆل)لەناوخوێن زۆرە.

٤-خواردنی دروست بخۆوئاگات لەکێشی لەشت بێت:خواردنی خـۆراکـی دروسـت هەنگاوێکی خۆپاراستنەلەنەخۆشی شەکرەونەخۆشیەکانی دڵ ونەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلە.هەوڵ بدەخوێی چێشت کـەم بەکاربهێنە لە نێوان (٥-٦گم)لەڕۆژێکداخوێی چێشت بەکاربێنە.هەمووکات خواردنت دەشتەکی بێت.ئەگەرکێشی لەشت زیادبێت هەوڵی خۆلاوازکردن بدە.

٥-وازلـەجـگـەرەکـێـشـان بـهـێـنـە:جـگـەرەچـوونـی خوێن بۆگورچیلەکان کەم دەکاتەوە،بەمەش کاری گورچیلەکان نـاتـەواوی تێدەکەوێت.هەروەهاجگەرەکێشان ئەگەری شێرپەنجەی گورچیلەکان بەڕێژەی (٥٠٪)زیاددەکات.

٦-دەرمـــانـــەژان لابـــەرەکـــان بـۆمـاوەیـەکـی زۆروبـەبـڕی زۆریەکارمەهێنە:دەرمانەژان لابەرەکان لەخۆوەبەکارمەهێنە. هەروەهاوەرگرتنی ئەودەرمانانەبەبێ ڕاوێـژی پزیشک ولە نۆڕینگەی لاکۆڵانان مانای ئەوەیەکەلەخۆوەبەکاری دەهێنیت وەمەترسی بۆسەرگورچیلەکانت زۆردەکات.

٧-ئەگەریەک لەویارانەی خوارەوەت هەبوو،پشکنینی چالاکی گورچیلەکان ساڵی یەک جاربۆخۆت بکە:

ا.نەخۆشی شەکرە.

ب.بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

ج.قەڵەوی.

ه.لـــەخـــانـــەوادەکـــەت نـــەخـــۆشـــێـــکـــت هـــەبـــووتـــووشـــی نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەببوو.

# نۆڕینگە

به سەرپەرشتی د. پشتیوان مامە
پسپۆڕی نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ
بۆرد (دکتۆرا) لە نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ





**پ/دایکی ئەحمەد: سەردانی پزیشکم کردووە، دەڵێت: هەوکردنی میزڵدانت هەیە. ئایائەوەنەخۆشیە؟ چارەسەری چییە؟**

و/میزڵدان یان میزدۆئەوئەندامەی کۆئەندامی دەردانەکەدوای بوونی میز، میزی تێداکۆدەبێتەوە. تادەکرێتەدەرەوە. هەوکردنی میزڵدان باووترین هەوکردنەکانی کۆئەندامی دەردانە. وەباووترین هۆکاری هەوکردنی میزڵدان بریتیەلەتووشبوون بەهەوکردنی بەکتریایی هەروەک هەوکردنی ڕێڕەوەکانی میز (UTI) لەوانەیەبەشێک بێت لەوهەوکردنەیان بەهۆی زۆرئیش کردنی میزدۆبێت یان بەهۆی گرێیەک بێت یان بەهۆی بوونی بەردلەناومیزدۆدابێت یان بەهۆی گیرانێک لەڕێڕەوی میزدوای میزدۆبێت. هەمووئەوهۆکارانەدەبنەهۆی یەک دیاردە، کەپێی دەووترێت: هەوکردنی میزڵدان (هەوکردنی میزدۆ (Cystitis،. پزیشک پشکنینی میزبۆنەخۆشەکەدەکات بۆزانینی هۆکاری هەوکردنەکەودەرمانی چارەسەری (دژەزیندەگی، (Antibiotic بۆنەخۆشەکەدەنووسێت. ئەگەربەوەچارەسەرنەکرا لەوانەیەپزیشک سۆناربۆنەخۆشەکە بکات بۆزانینی هۆکاری تووشبوون بەهەوکردنی میزدۆ. نابێت بەبێ ڕاوێژی پزیشک دەرمان بۆهەوکردنی میزدۆبەکاربهێنیت، وەرگرتنی دەرمان لەنۆڕینگەکانی لاکۆڵانانیش بەبێ ڕاوێژی پزیشکە. زۆردەرمان هەن یەکێک لەکاردانەوەلاوەکیەکانی بریتیەلەدروست بوونی هەوکردنی میزدۆ. هەروەهابوونی کرم بەتایبەتی ئەوکرمەی پێیدەووترێت: کرمی دەرزیلەیی کەلای خۆمان زۆربەربڵاوەنیشانەی وات بۆدروست دەکات هەرکت ومت هەوکردنی میزدۆیە. بۆیەوەرگرتنی چارەسەردەبێت بەپێی ڕاوێژی پزیشکی تایبەتمەندبێت.

**پ/سالار: چارەسەرکردنی بڕمیزی چییە؟**

و/زۆربەی کات بڕمیزی لەئافرەتان دەبێت بەتایبەتی دوای زگ وزارکردن. هۆکارەکەی خاوبوونەوەی ئەو پارچەگۆشتەیە (ماسولکە، (Sphincter Muscle کەوەک دەرگاوانەک کاردەکات لەمیزدۆ. یەکەم هەنگاولەچارەسەرکردنی بریتیەلەبەهێزکردنی ئەوماسولکەیەبەسازدانی چەندوەرزشێک ئەگەرهەرچارەسەرنەکرائەوکات چارەسەری تایبەت بەکارەبایی بۆی بەکاردێت، ئەگەرهەرچارەسەرنەکرائەوکات نەشتەرگەری بۆدەکرێت. دەبێت سەردانی پزیشکی تایبەتمەندی ڕێڕەوی میزبکات ونەشتەرگەری چاککردنەوەوجوانکاری بۆئەوماسولکەیەبکات.

**پ/ئازاد: هۆکاری میزبەخۆداکردنی شەوان لەمنداڵان چییە؟**

و/میزبەخۆداکردن لەشەودابەبێ ویستی منداڵەکەیەبەزۆریش لەمنداڵان کەتەمەنیان لەدەساڵ کەمترەباوە. مەزەندەدەکرێت هۆکارەکەی نارێکی لەوبەشەی کۆئەندامی دەماربێت کەفەرمانی دەست گرتنەبەسەرمیزدۆ، تەواوکارەکان جێبەجێ ناکات. هەتاهەشت ساڵی ئەودیاردەیەهیچ چارەسەرێکی ناوێت (واتەتامنداڵەکەفەراقەنەبێت و چاکەوخراپەنەزانێت) چارەسەری ناوێت. تەنیامەگەرمنداڵەکەبەڕۆژیش میزبەخۆدابکات یان لەگەل میزبەخۆداکردن هەوکردنی ڕێڕەوەکانی میزیشی هەبێت ئەوکات پێویستەچارەسەروەربگرێت. بەڵام دوای تەمەنی هەشت ساڵی بەتایبەتی کەمنداڵەکەفەراقەدەبێت ودێت چاکەوخراپەی بزانی، وای لێدێت کاردانەوەی خراپی لەسەرباری دەروونی منداڵەکەدەبێت ئەوکات پزیشک ئەودەرمانانەی بۆدەنووسێت کەیارمەتی گورچیلەکان دەدات کەمیزلەشەوداقەتیس بداتەوە. بەزۆریش بۆماوەی شەش مانگ تایەک ساڵ دەدرێت. هەندێک جاریش لەوانەیەچەندمانگێکی تاکۆئەندامی دەمارتەواوکارەکانی چووست دەبێت وناهێڵێت لەشەومیزبەخۆیدابکات.




## پ/ماهیر:شووشتنی گورچیله (غسل الكلى) چییه؟سوودوزیانەکانی چین؟

و/شووشتنی گورچیلەڕێگاچارەیەکەکەلەوانەیەکاتێک یەکێک پەککەوتنی هەبێت وپاشماوەوئاوی زۆرلەلەشی کۆببێتەوەشووشتنی گورچیلەی بۆبکرێت.

دووجۆرشووشتنی گورچیلەهەیە:

١-بەڕێگای خوێن (Hemodialysis):خوێنی نەخۆش بۆناوئامێرێک دەبردرێت،کەفیلتەری تایبەتی تێدایەبۆلابردنی پاشماوەوئاوی زیادەی ناولەشی نەخۆشەکە.

خوێنەکەبەناوئەوفیلتەرانەکەپێیان دەووترێت:پەردەی شووشتن (Dialysis Membrane)دەچێت.ئەمەش پێویستی بەبوونی سۆندەیەک (Tube)هەیەکەلە نێوان خوێنبەروخوێنهێنەردادەنرێت.هەندێکجاربەستنێک لەنێوان خوێنبەروخوێنهێنەردادەنرێت لەقۆری نەخۆش (Climino Fistula).هەردووک چ بەستنی خوێنبەروخوێنهێنەرچ بەچاندن بێت (Graft)یان بەستنی لەخۆوەبێت (Fistula)لەڕێگای سۆندەیەک لەسەرمەکینەکەدادەنرێت وخوێنی نەخۆش بەناوپەردەی شووشتنی ناومەکینەکەدەبردرێت ولەناومەکینەکەشلەی شووشتنەکەپاشماوەوئاوی زیادەلەخوێنەکەوەردەگرێت.د واترخوێنەخاوێنکراوەکەلەلایەکیترەوەبۆنەخۆشەکە دەگەڕێتەوە.

٢-بەڕێگای زگ (Peritoneal Dialysis):لەزگی نەخۆشەکەلەدەوری ناووک کونێک دەکرێت. سۆندەیەک (Catheter)لەڕێگای ئەوکوونەڕەوانەی ژووریٚ دەکرێت.بە بەکارهێنانی چەندجۆرەشلەیەکی شووشتن بەوسۆندەیەڕەوانەی ژوورەوەدەکرێت وریخۆڵەی نەخۆشەکەوەک پەردەیەکی دەڵاندن لەنێوان خوێن وئەوشلەیەکاردەکات.

پاشماوەوئاوی زیادەبەورێگایەلەلەشی نەخۆشەکەدەردەکرێت.

سوودوکاردانەوەلاوەکیەکانی شووشتنی گورچیلە؟هەریەک لەودووجۆرەشووشتنەسوودوکاردانەوەی لاوەکی تایبەت بەخۆیان هەیە.ئایاکاوەیان باشترە؟ئەوەبەندەبە چەند هۆکارێک،لەوانە:گوزەرانی ژیانی نەخۆش وبوونی نەخۆشیترلەگەل نەخۆشی گورچیلەویاری دارایی وهەست بەبەرپرسیارێتی کردنی.ئەوانەهەموولەبەرچاودەگیرێت ئەوکات بڕیارلەسەرجۆری شووشتنەکەدەدرێت.لەگەل شووشتنەکەنەخۆش دەبێت گوێڕایەلی ئامۆژگاری پزیشک بێت وپارێزی لەخۆراک وچۆنی بۆدانراوەجێ بەجێ ی بکات ودەرمانەکەوەربگرێت.شووشتن بەڕێگای شووشتن بەڕێگای خوێن کەمترپێویستی بەهاوکاری نەخۆش دەبێت.هەرچەندپێویست دەکات نەخۆش نۆرەبگرێت ولە کاتی دیاریکراوبۆیەکەی شووشتنی کورچیلەبێت.هەرچی شووشتن بەڕێگای زگ:ئەوانەخۆش لەهەرجێگایەک بێت دەتوانرێت شووشتنەکەی بۆبکرێت.تەنانەت لەماڵیش بەلام گرنگترین مەترسی بریتیەلەتووشبوون بەهەوکردن بەهۆی بەکتریا.

# هەواڵی پزیشکی

### خواردنی دروست گورچیلەکان تەندروست دەکات

زانایانی بواری پزیشکی بۆیان ڕوون بۆتەوە :کەزۆرخواردنی سەوزەومیوەوکەم خواردنی ئەوخواردنانەی کەبڕی زۆریان لەخوێ تێدایە .هەروەهاکەم خواردنی گۆشتی سۆروخواردنەئامادەکراوەکان وخواردنەوەگازدارەکان کەشەکریان تێدایەوادەکات کەئەگەری مەترسی تووشبوون بەنەخۆشی گورچیلەکەم دەکاتەوە .لەووڵاتی ئینگلیزپزیشکان لەئەنجامی سێ لێکۆڵینەوە کەلەسەر (٤٥٨٢١)پیاوبۆماوەی هەژدەساڵ کراوەگەیشتن بەوبڕوایەی کەئەوکەسانەی کەپارێزی دەکەن بۆخۆپاراستن لەتووشبوون بەنەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،ئەوانەبڕی زۆرلەسەوزەومیوەوگەنم بابەتەکان وبەروبوومی شیرونانی گەنم زۆردەخۆن بۆتووش نەبوون بەنەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.هەروەهائەوانەکەمترخواردنەسوورەکان وئەوخواردنانەی کەبڕی زۆری لەتوخمی کالیسیۆم ومەگنیسیۆم وڤیتامین C وسۆدیۆمیان تێدایەبەکاردێنن،ئەوانەئەگەری تووشبوونیان بەبەردی گورچیلە بەڕێژەی (٤٠-٤٥٪)کەمترە بەبەراوردلەگەل ئەوانەی کەپارێزیان نەکردووەوهەموخواردنێکیان خواردووە .زانایان ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە :جۆری خۆراک کاردانەوەی ڕاستەوخۆی لەسەرتووشبوون بەنەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن وتووشبوون بەنەخۆشی شەکرەونەخۆشیەدرێژخایەنەکان کەدەبنەهۆی دروست بوونی بەردلەگورچیلە .گرنگیدان بەخواردن مەترسی تووشبوون بەبەردی گورچیلە کەم دەکاتەوە.

### گورچیلەکان ومیکانیزمی سەربەخۆی ڕێکخستنی فشاری خوێن

دۆزینەوەیەکی نوێ ئەوەی ڕوونکردەوەکەلە گورچیلەملیۆنەهایەکەهەیەکاریان ڕێکخستنی خوێیەکانەلەناولەش.ئەم دۆزینەوەیەڕێگایەکی نوێ دەبینێتەوەبۆچارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.گورچیلەلەیەک ملیۆن یەکەی پاڵاوتن پێکدێت کەپێیان دەووترێت (نیفرۆنەکانی گورچیلە). ئەویەکانەکاریان لابردنی پاشماوەی زیندەکارلێکەکانەلەناوخوێن ولابردن ودووبارەبکارهێنانەوەی ئەومادانەی بۆلەش پێویستن وفڕێدانی ناپێویستەکان.کۆتایی دواوەی نیفرۆنەکان کاری ڕێکخستنی فشاری خوێنەکەکۆنترۆلی خوێی سۆدیۆم لەخوێن دەکات.زانایان لەزانکۆی تەکساس میکانیزمی ئەوکارەی نیفرۆنەکانی ڕوونکردەوە. ئەوەیان پیشانداکەئەومیکانیزمەبەتەواوی لەناوگورچیلەیەولەژێرگۆنترۆلی ناوگورچیلەیە. کارانەبوونی ئەوسیستەمەدەبێتەهۆی کۆبوونەوەی خوێی سۆدیۆم لەلەشداوبەرزبوونەوەی فشاری خوێن.ئەم لێکۆڵینەوەیەبووەهۆی ئاشکراکردنی سیستەمێکی نوێ لەناولەش کەکۆنترۆلی فشاری خوێنی لەئەستۆدایە.ئەمەش هاوشانی ئەوسیستەمەی کەپێشترناسرابوو(Renin-Angiotensin-aldosterone System)کەلەدەرەوەی گورچیلەکان کاردەکەن.ئەمەش ڕێگاخۆش دەکات بۆ دۆزینەوەی دەرمانی چارەسەری نوێ بۆنەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

### خواردنی ڕۆژئاواوپەککەوتنی گورچیلە

لێکۆڵینەوەکان لەم دواییانەدادەریان خستووەکەخۆراکی ووڵاتانی ڕۆژئاوا (کەپڕن لەچەوری تێروگۆشتی سۆروشیرنەمەنیەکان)ئەگەری تووشبوون بەپەککەوتنی گورچیلەزیاددەکەن .لێکۆڵینەوەکەلەسەرزیاترلە٣١٢١ئافرەت لەماوەی یازدەساڵ کراوە .بینراکەئەوئافرەتانەی ئەورژێمەخۆراکانەی کەپڕن لەگۆشتی سۆروگۆشتی سۆرکراووچەوریەتێرەکان وشیرنەمەنیەکان بەکاردێنن،مەترسی زۆریان بەتووشبوون بەپەککەوتنی گورچیلە هەیە .بەپێچەوانەوەئەوئافرەتانەی کەئەوخۆراکانەبەکاردێنن کەپڕن لەسەوزەومیوەوئەوانەی چەوریان کەم تێدایەوماسی ومریشک زۆردەخۆن لەومەترسیەبەدوورن.زانایان ئەوەیان ڕوونکردۆتەوە: (کە گورچیلەئەندامێکی پڕمووولوولەی خوێنە،هەرلەبەرئەوەئەوخۆراکانەی ئەگەری تووشبوون بەنەخۆشیەکانی دڵ ومووولوولەخوێنیەکان زیاددەکەن،هەرهەمان ئەوهۆکارانەدەبنەهۆی زیادبوونی ئەگەری تووشبوون بەپەککەوتنی گورچیلە.

# خوێن میزتن (Hematuria)

میزتنی خوێن نیشانەیەکی باوە. بەوەدیاری دەکرێت،ئەگەرمیزبەچاوبینراڕەنگی سوورهەڵگەڕابوو،وەکوخوێن یان لەژێروورد‌بین پشکنین کراوبینرازیاترلەدەخڕۆکەی سوورلەناومیزهەیە ، دەووترێت : کەسەکەتووشی خوێن میزتن بووە.خوێن میزتن نیشانەی بوونی نەخۆشیەکەلەگورچیلەکان بەڵام پێویستەجیاوازی لەنێوان خوێن میزتن وسووربوونی ڕەنگی میزبەهۆی دەرمان وخۆراک وماددەکیمیاویەکان بکرێت (وەک:تێکەڵ بوونی هیمۆگلۆبین بەمیزلەکاتی تووشبوون بەنەخۆشی لەرزوتایان ژەهراوییبوونی خوێن یان ئەگەرکەسەک خوێن وەربگرێت وخوێنەکەی لەگرووپی خۆی نەبێت یان کەسێک هەندێک دەرمان بەکاربێنێت کەڕەنگی میزەکەی سووردەکات).

**هۆکارەکانی:زیاترلەسی هۆکاری خوێن میزتن هەیە،گرنگترینیان:**

١-هۆکاری نارێکی لەکیمیکەپێکهاتەی میزکەهۆکاردەبێت لەدروست بوونی بەرد.

٢-تووش بوون بەهەوکردنەکان:وەک تووش بوون بەنەخۆشی سیل یان بەلهارزیایان هەوکردنی حەوزی گورچیلەوهەوکردنی میزدۆ.

٣-بەهۆی نەخۆشی دیاریکراوەوە):وەک:نەخۆشی خوێن شل بوونەوە (هیمۆفیلیا)وشێرپەنجەی خوێن وخەست بوونەوەی خوێن (زیادبوونی خڕۆکەسوورەکان)و نەخۆشی کەم خوێنی شێوەداسی (Sickle Cell Anaemia)،نەخۆشیەکانی بەرگری لەخۆوە).

٤-بەهۆی تووش بوون بەشێرپەنجە: (وەک:شێرپەنجەی گورچیلەکان وشێرپەنجەی میزڵدان وشێرپەنجەی پرۆستات).

٥-بەهۆی بەکارهێنانی هەندێک دەرمان،وەک:ئەودەرمانانەی خوێن شل دەکەنەوەیان بەکارهێنانی هەندێک ماددەی ژەهراوی کەدەبێتەهۆی هەوکردنی گورچیلەکان.

٦.تووش بوون بەڕووداو (Trauma)وەک:لەڕووداوی هاتووچۆیان برینداربوونی گورچیلەبەفیشەک یان چەقۆیان بەهۆی هەڵەیەکی پزیشکی لەکاتی کردنی قەستەرەی بۆری میز.

٧.نەخۆشیەزگماکیەکان (Congenital):بۆنموونەکۆمەڵ ەکیسی گورچیلەکان.

*بۆجیاکردنەوەی ئەوهۆکارانەلەیەکتری،دەتوانین بەپشکنینی پزیشکی بزانین.بۆنموونە:زانینی تەمەنی نەخۆشەکەگرنگەبۆزانینی هۆکاری خوێن میزتنەکە.ئەگەر نەخۆشەکەپیربووئەواهۆکاری خوێن میزتنەکەئەستووربوون وگەورەبوونی پرۆستاتە . ئەگەرنەخۆشەکەگەنج بووئەواهۆکارەکەلەوانەیەبەهۆی بەردی گورچیلە یان بەهۆی نەخۆشی بەلهارزیابێت.هەروەهازانینی چیرۆکی ڕوودانی نەخۆشیەکە یارمەتیدەرە لە دیاریکردنی هۆکاری نەخۆشیەکەبۆنموونەنەخۆشی شل بوونی خوێن (هیمۆفیلیای هەبێت.پرسیارکردن لەنەخۆش،ئایاهیچی بەرکەوتووە؟یان پێشتربەردی هەبووە؟لەوانەهەمووی گرنگترپرسیارکردنەلەبوونی ژان؟ئەگەرژانی هەبوولەوانەیەبەهۆی هەوکردن یان بوونی بەردبێت بەڵام بەبێ ژان بەزۆری بەهۆی شێرپەنجەیە.

**جۆرەکانی خوێن میزتن:**

١-خوێن میزتن لەسەرەتای میزکردن: (بەزۆری بەهۆی نەخۆشیەکی میزەڕۆیان میزدۆیان پرۆستات دەبێت).

٢-خوێن میزتن لەکۆتایی میزکردن: (بەزۆری بەهۆی تووش بوون بەبەلهارزیادەبێت).

٣-خوێن تەواولەگەل میزتێکەل دەبێت:کەسەکەکەمیزدەکات لەسەرەتای میزکردن هەتاکۆتایی میزی خوێناوی دەبێت (بەهۆی خوێنبەربوونی گورچیلەکان یان میزڵدان دەبێت).

***دیاریکردن:**

١-سەیرێکی تەندروستی گشتی نەخۆشەکەبکرێت. بزانرێت تاچەندنەخۆشیەکەی کاری لەسەرکردووە. نەخۆشیەلەناکاوەکان لەوانەیەببێتەهۆی دابەزینی فشاری خوێن هەرچی نەخۆشیەدرێژخایەنەکانەلەوانەیەنەخۆشەکەڕەنگی زەردهەڵ بگەڕێت بەهۆی تووشبوونی بەکەم خوێنی.

٢-پشکنینی بەدەست:پشکنینی زگ وتەنکێشەکان وئەندامەکانی زاووزێ.سەرنج دانیان:بزانین هیچ شین ومۆربوونەوەیەکیان پێوەیە.بۆزانینی ئەوەی نەوەک کەسەکە تووشی ڕووداوێک بووبێت وبیری نەمابێت.هەرچی تەنکێشەکان لەکاتی پشکنین بەدەست لەوانەیەهەست بەبوونی خوێن تێزان بکەین یان لەوانەیەکەسەکەهەست بەئازاربکات ئەگەرتووشی هەوکردن بووبێت.

٢-لەبنی زگ لەدوومیزدۆبگەڕێین وبپشکنین:بۆزانینی ئایاپڕمیزەیان نا؟بەتایبەتی لەورووداوانەی کەئێسکی حەوزتیایادەشکێت.کەزۆرجارلەوانەیەنەخۆشەکەتووشی پچڕان وبرینداربوونی میزەڕۆبێت.

٤-پشکنینی کۆم بەپەنجەلەلایەن پزیشک:بۆزانینی ئایاڕژێنی پەنکریاس ئەستووربووەیان نا؟

# کەم خوێنی لەنەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن

## Anaemia in Chronic Renal Failure

د.بەکررەحمان لهێیانی
پزیشک لەبەشی هەناووگورچیلەکان
ئەندامی دەستەی پزیشکانی گورچیلەی هیندستان
ئەندامی دەستەی شۆردنی گورچیلەی پریتۆنی هیندستان
ئەندام لەگۆڤاری (Nephrology)هیندستان

پاش ئەوەی کەگورچیلەکان تووشی پەککەوتنی درێژخایەن دەبن ئەوادەبێتەهۆی تێکچوونی هەندێک ئەرک وکارەکانی ئەندامەکانی لەش.وەکۆمەڵێک کاریگەری نەرێنی لەسەرلەشداهەیە.کەم خوێنیش یەکێکەلەماکەکانی پەککەوتنی گورچیلەکان.لێرەدابابزانین:هۆکاری ئەم کەم خوێنییەچییەکەتووشی نەخۆشەکانی پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن دەبێت:

١-پاش ئەوەی گورچیلەکان تووشی پەککەوتنی درێژخایەن دەبێت ئەواکاریگەری دەکەوێتەسەرهۆرمۆنی (اریپرۆپۆیتین (ERYTHROPOITEN،کەبەکاری گورچیلەکانەوەئەم هۆرمۆنەکاری خۆی ئەنجام دەدات،کەوادەکات خوێن دروست بوون لەئێسقانەکان ڕووبدات.کاتێک کەئەم هۆرمۆنەتووشی تێکچوونی ڕێژەیی دەبێت،بەکەم بوونی ئەواخوێن دروست بوون لەبەشی ئێسقانەکان ناتەواودەبێت،ئەواکەم خوێنی ڕوودەدات.لێرەداپێویستەئەوەبزانین کەئێستاشورنقەی دروستکراوی هۆرمۆنی ئیرپرۆپۆیتین (EPREX)هەیە.لەنەخۆشخانەکانی گورچیلەکەبەکاردێت بەگوێرەی کەم خوێنی نەخۆشەکە،کەیان هەفتانەجارێک یان دووجارئەم شورنقەیەلەژێرپێست دەدرێت.کێشەکانی ئەم شورنقەیەئەوەیە:دەبێتەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،خوێن مەیین لەناوخوێنبەرەکان،هەندێک جارنەخۆش تووشی پەسیووێکی سووک دەبێت.

٢-هۆکارێکیتری کەم خوێنی لەنەخۆشیەکانی گورچیلەی درێژخایەن،ئەوەیە:کەڕێژەی ماددەی (ئاسن)یان (فولیک ئەسید)لەلەش کەم دەبێت.ئەویش بەهۆی کەم خواردن کەنەخۆش دووچاری دەبێت لەپەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن یانیش بەهۆی خوێن بەربوونی جیاوازلەگەدەوڕیخۆڵەبەهۆی تێکچوونی باری خەپلەکانی خوێن. کەئەمەش وادەکات خوێن بەربوون لەگەدەدروست ببێت.کەنیشانەکانی:ڕشانەوەی خوێن یان پیسایی نەخۆش ڕەنگی ڕەشێکی قیراوی وەردەگرێت بەهۆی تێکەڵاوبوونی خوێن لەگەلی.

٣-هۆکارێکیتری ئەم جۆرەکەم خوێنیانەی نەخۆشی پەککەوتنی درێژخایەنی گورچیلە:هەندێک جارهۆکاری وەرگرتنی خوێن لەنەخۆشیەکەبەشێوەیەکی بەردەوام.کەئەمەش بۆپێداچوونەوەی باری نەخۆش ڕۆژانەدەکرێت،بۆزانینی ڕێژەی (یوریا)و (کریاتینین)وهیترئەوادەبێتەهۆی نزم بوونەوەی ڕێژەی خوێن لەلەشدا.

٤-هەندێک جارشۆردنی گورچیلەکان بەبەردەوامی بەڕێگای خوێن کەهەفتانەجێبەجێ دەکرێت،دەبێتەهۆی خوێن کەمی،هۆکارەکەشی ئەوەیە:یان ئامێری شۆردنەکە (فلتەری)شۆردنەکەکاردەکاتەسەرتێکشکانی خڕۆکەسوورەکانی خوێن،کاتێک بەناوی دادەڕوات.یـان بەهۆی لەدەستدانی خوێنی نەخۆشەکەلەکاتی بێ ئاگایی کارمەندانی سەرئامێری شۆردن،کەئەمەش دەبێتەهۆی بەرەلابوونی خوێن لەشوێنی وەرگرتن ودانەوەی خوێن.

٥-شێوەیەکیترکەم خوێنی کەڕوودەدات،لێرە:لەوانەیەهۆی ئەودەرمانەنەش بێت،کەبەکاردێت لەنەخۆشیەکانی پەککەوتنی گورچیلەکان وەک:پریدنیزولۆن،ساندیومون کەهەندێ جاردەبنەهۆی داڕووشانی دیواری گەدەوخوێن بەربوون.هەرلەبەرئەوەزۆرجارلەگەل ئەم دەرمانانەدەرمانی پاراستنی دیواری گەدەبەکاردێت.

# تەندروستی دەم وددان ونەخۆشیەکانی گورچیلە

د.موئەیدئیبراهیم ئەمین
پسپۆڕی چارەسەرکردنی ددان وپڕکردنەوەی ددانەکان

نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی گورچیلەبەتایبەتی پەککەوتنی گورچیلە (عجزالكلیە)ڕۆژبەڕۆژلەزۆربوون دایەبەهۆی زیادبوونی هۆکارەکانی تووشبوون بەپەککەوتنی گورچیلە،وەک:زۆربەکارهێنانی خوێی چێشت،بەرزبوونەوەی فشاری خوێن،نەخۆشی شەکرە،گیروگرفتەکانی ڕێڕەوەکانی میزوەک بەردی گورچیلەوهەوکردنەکانی گورچیلە.نەخۆشیەکانی گورچیلەبەگوێرەی توندی وماوەی نەخۆشیەکەپۆلێن دەکرێت.هەرلەهەوکردنی لەناکاوودرێژخایەن بگرەتادەگاتەنەخۆشی پەککەوتنی گورچیلە.کاردانەوەی هەموویان لەسەرلەش بەندەبەسەرڕادەی ئەوزیانەی کەلەشانەکانی گورچیلەی دەدەن،ئایاچەندرێژەی نیفرۆنەکانی گورچیلە (Nephrones)کاردەکەن وچەندیان چالاکن وچەندیان لەناوچوون؟وتوانای پاڵاوتنی ماددەی کریاتینین (Creatinine)لەخوێن بۆمیزچەندە؟هەربەلەبارچاوگرتنی ئەوەی کەسێک نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەی هەبوو،لەهەمان کاتدائاریشەی دەم وددانی هەبوو،پزیشک بەم شێوەی خوارەوەچارەسەری پێدەدات:

١-نیشانەسەرەتاییەکانی هەوکردنی گورچیلەی درێژخایەن هەندێک جارنادیارەیان نیشانەکانی کە مەبۆنموونە:لەوانەیەتەنیابەرزبوونەی فشاری خوێن یان ژانی گورچیلەبێت،لەوبارانەداتوانای ڕێکخستنی ئەلیکترۆلیتەکان (Electrolyte)کەمەوناڕێکە:ئەگەر





ئەوکەسانەگیروگرفتی ددانیان هەبوو،ئەوانەلەکاتی پێدانی دەرمان وچارەسەرکردنی ئاریشەی ددان وەکوکەسی ئاسایی ئەژمارددەکرێن.

٢-بەڵام ئەگەرنەخۆشەکەنەخۆشیتری لەگەل نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەهەبوویان نەخۆشی پەککەوتنی گورچیلەکەی زۆری لۆهێنابووکەبووەهۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی بوونی یوریالەخوێن وتێکچوونی ڕێژەی کالسیۆم وفۆسفات لەخوێن بەهۆی لەناوچوونی بەشێکی زۆری شانەکانی گورچیلە،ئەوەبەپەککەوتنی گورچیلە دادەنرێت.لەوبارانەداپزیشکی ددان دەبێت ڕاوێژی پزیشکی تایبەتمەندی وچارەسەرکەروەربگرێت. پێش ئەوەی هەرچارەسەرێک بۆدەم وددانەکان دابنرێت،بەتایبەتی ئەگەرچارەسەرەکەی دەم وددانی بەنەشتەرگەری بوو.

٣-لەوحالەتانەداکەگورچیلەلەقۆناغەکانی کۆتایی پەککەوتنی گورچیلەیە:ئەواهەرنەشتەرگەرییەک بۆدەم وددانەکان بکرێت دەبێت نەخۆشەکەلە نەخۆشخانەبخەوێنرێت بۆ دووربوون لەهەرماکێک بەهۆی نەشتەرگەرییەکەیان ماندووبوون بەنەشتەرگەرییەکەڕوودات.هەروەهائاگاداری نووسینی دەرمان بین بەتایبەتی ئەودەرمانانەی کەلەڕێگای گورچیلەدەکرێنەدەرەوەچونکەلەکاتی تەواوکارنەکردنی گورچیلەکان ئاستی دەرمانەکەلەناوخوێن بەرزدەبێت وماوەیەکی زۆرترلەکەسی ئاسایی دەرمانەکە لەناوخوێن دەمێنێتەوە.هەروەهائەو دەرمانانەی کەگورچیلەتووشی ژەهراوی بوون دەکەن، بۆ نموونە (تیتراسایکلین، دەرمانەژان لابەرە ناستیرۆیدیەکان (وەک:پرۆفین)، ئەسپرین،ژەمی زۆری دەرمانی سەرئێشان (پاراسیتۆل) نەدرێت بەنەخۆشەکە.

٤-هەرچی ئەونەخۆشانەن کەکرداری شووشتنی گورچیلەیان بەڕێگای خوێن (Haemodialysis) بۆدەکرێت:ڕاوێژوەرگرتنی پزیشکی چارەسەرکەری پێش سازدانی هەرچارەسەرێک بۆدەم وددان زۆرپێویستەبۆزانینی کات ونۆرەی شووشتنەکەبەڕێگای خوێن (Haemodialysis) لەبەرئەوەئەوشووشتنەپێویستی بەماددەی هیپارین (Heparin)دەبێت کەخوێن شل دەکاتەوە.

# Awamedica

*Committed to Quality*




## Metronidazole Awa

Each film-coated tablet contains:
Metronidazole BP 500 mg.
20 tablets.

Metronidazole Awa is used for the treatment of a variety of bacterial infections and protozoal infections.

Dosage and administration:

Please read package information leaflet for more information!




## Metformin Awa 500

Each film-coated tablet contains:
Metformin Hydrochloride BP 500 mg.
30 tablets.

Metformin Awa 500 is an anti-diabetic drug used for the treatment of Type 2 diabetes.

Dosage and administration:

Adults: 1 tablet, 2-3 times/day.
Children 10 years and older: 1 tablet/day.
Or as prescribed by your doctor.




## Ciprofloxacin Awa

Each film-coated tablet contains:
Ciprofloxacin Hydrochloride USP equivalent to 500 mg of Ciprofloxacin.
20 tablets.

Ciprofloxacin Awa is an Antibacterial drug used to treat several types of infection. It is specially used for the treatment of chest, intestine and urinary tract infections.

Dosage and administration:

Swallow the tablet with a full glass of water. Try to take the tablets at the same time each day. Do not exceed the stated dose.

The treatment usually lasts from 5-21 days, but may take longer for severe infections.

Adults:

Recommended dose: 1 tablet twice daily, or as prescribed by your doctor.

www.awamedica.com - info@awamedica.com
Peshawa street - P.O. Box 0116-49
+964 750 7113737
Erbil - Kurdistan region - Iraq



هەرجارەوباسێک

# هۆپ

تۆڕێگای ئامۆژگاری کردنی منت هەیە،بەڵام هەرگیزتوانای ئەوەت نیەڕتۆک لەچاوم ڕابکەیت.هەمووکاتیش سنووری ئازادی تۆلەلای سنووری ئازادی من دەوەستێ. گوومان کردن لەهاوڕێکەت پیسترەلەناپاکیەکەی!نازانم ناوی چیت لێ بنێم:ڕۆشنبیر،زانا،ڕۆناکبیر،ئەدیب،پێشەوا.هەریەکێکیان هەڵدەبژێری،هەڵبژێرەبەڵام لەژێرهیچ ناوێکداوبەبێ هیچ پاساوێک نابێ ناوی یەکێکیترزەربکەیت.بەبیانووی توانج،ڕەخنە،ئاگاداریکردنەوە،ئامۆژگاری، ڕاست کردنەوە،ڕێپیشاندان.مرۆڤی بنیادەمیش ئەومرۆڤەیەکەناتەواوی وناگوزوری برای هاووڵاتی دابپۆشێ. لەگرفت وتەنگاوی بەهانایەوەبچێت.دەست پێشخەرویارمەتی پێشکەش بکات ئەویش بەکردەوەنەک بە قسە. تەنگانەش دەرروونی ئادەمیزادتاقی دەکاتەوە.خۆشەویستان توانای زوویربوونیان لەیەکتری نیەبەڵام هەقی گلەیی کردنیان لەیەکتری هەیە.ڕاگەیاندن لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندالەگەڵ ئەوهەمووپێشکەوتنەی کەمرۆڤایەتی بەخۆیەوەبینیووەبەڵام لەئاست هەل ومەرجی ئێستادانیە!؟ ڕاگەیاندنی بواری تەندروستی لەکاتی ئێستادا هەرسەلاواتی دەوێت؟کوو؟لەیەک لەبەرنامەکان کەلەیەکێک لەکەناڵەئاسمانیەکان پەخش کرا.زاتێکیان هێناوەهەمووئەوپێشکەوتن وپسپۆڕیەی لەسەرانسەری کوردستان هەیەبەلاوەی نابووباسی لەسەرهەندێک کەم وکووڕی بواری تەندروستی کوردستان دەکرد.ئەوانەزگیان عەمباری گووندیەکاسەلێس وماستاوچی بوونە،کەی وکێ ڕێگای پێداکەبواری تەندروستی لەکوردستان هەلبسەنگێنێت.ئەتوونەزانین وبێئاگایی کاکی بێژەرهەرلێگەڕێ!!بەسەری هەمووتان کەسووندتان لەسەرم نیە.برادەرێک کەخاوەنی زیاترلەبیست کیتابی ئەدەبیەگووتی:بێژەرێک هاتووەچاوپێکەوتنم لەگەڵ بکات.منیش پێم گووت:چەندکیتابی منت خوێندۆتەوە؟لەوەلام گووتی:هیچ. گووتم:باشەتۆچۆن من دەناسی ئەگەرنووسینەکانی منت نەخوێندبێتەوە. بەقسەی ئەوتەرحەکەسانەبێت،کوردستان بێ سیستەمی تەندروستیەوهیچ خزمەتێک پێشکەش بەخەلکی ناکرێت. ئەی ئەوانەی قسەی لەبەرکی خۆدەژمێرن:ئێوەبێ ئاگان؟!ترسنۆکن.لەمێژوو،مرۆڤایەتی بپرسەهەرپزیشکانی کوردستان نەبوون لەخزمەتی میللەت دابوون وبەبێ پارەونان وەکوبراپێشمەرگەکانیان گیان لەسەردەست بوون بۆخزمەت کردنی گەلی کوردستان؟؟دەبپرسن!!دەبپرسن!!بزانن وابوویان وانەبوو.ئەمەلەلایەک لەلایەکیترلایەنی پەیوەندیدارکەباسی سیستەمی تەندروستی دەکات بۆپرس بەپزیشکەبەڕێزەکانی کوردستان ناکات،ئایا چ سیستەمێک لەگەڵ ئێمە دەگوونجێت.سوودلەبەهرەوتوانای خۆماڵی وەربگیرێت.نەک هەندێک کەس بێنن،بلێن:خەڵک لۆبرسیەتی باکێک وشیری بخۆن.بووسرمانەک لەولای ڕاستبۆوە:ئەوەباسی چ دەکەیت،هیلاک. ئەمنیش گۆتم:لۆ؟گۆتی سووندت لەسەرم نیە؟؟لەوانەهەمووی گەڕێ یەکێک لەڕۆژنامەگەورەودیارەکانی ئەوکوردستانەلاپەڕەی تەندروستی ئافرەتێک بەڕێوەی دەبات،خەریجی سێی ناوەندییەئەگەربەسەرنووسەرەکەی بلێیت:بۆلای نابەیەت،جەوابی ئەوەیەفەقیرە!!زەمیرت هەبی؟!!برادەرەکەگۆتی:پێم گۆت مامۆستا ئەمن نەزەمیرم دیتیە،نەدەیناسم وهەرجیرانیشم نەبووە!!!قوربانت بم،حکوومەت پیاوەتی نازانێت تەنیارەسمیاتی هەیە.لۆلایەنی مرۆڤایەتی لەگەڵ کاروباری ئیداری تێکەڵ دەکەیت؟جەوابی ئەوەبوو:لەوقسەگەورانەناگەم؟؟! ڕاگەیاندنی کوردی گرنگی بەوپێشکەوتن وخزمەتەزۆرەی تەندروستی بدەن کەلەکوردستان هەیە،کەزۆربەی دانیشتووانی ناوەڕاست وباشووری عیراق ئێستا بۆچارەسەرکردن ڕوودەکەنەشارەکانی کوردستان.ئەودەست ڕەنگینی ولێهاتووەیەی لەپزیشکانی کوردستان هەیەبیخەنە بەردیدی خوێنەران.ئەی نەتان بیستووە:دۆستان لەلای خەڵکی بەسەریەکتری داهەڵدەڵێن وکەلەگەڵ یەکتریش بوون سەرزەنشتی یەکتردەکەن. زۆرم لەدری مابووبەس لێرەبابەس بێت.

د.دێدەوان